# پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵ

نووسینی

ئا. مکارنکو

وەرگێڕانی

مستەفا غەفور

کوردستان- ٢٠٠٦


**ناوی کتێب: پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵ**

- نووسینی: ئا، مکارنکو
- وەرگێڕانی: مستەفا غەفور
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــه حسين
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- پیتچین: محمد مامند
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: (٥٩)
- چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠٠٥
- نرخ: (١٠٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب: -٦٠- (١٦٣)



**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@ maktoob.com

**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311

www. Mukiryani.com

## پێرست

دەگێرنەوە دایکێك کۆرپە یەکساڵانەکەی دەباتە لای زانایەك لێیدە پرسی: لە کەیەوە پێویستە منداڵەکەم پەروەردەکەم؟

زانایەکە تاوێك رادەمێنێ تا تەمەنی منداڵەکە مەزەندە بکات ئەوسا لە وەڵامدا دەڵێ: خاتوون تۆ دوانزە مانگ دواکەوتووی!

ئەم داستانە مانایەکەی روونە، پەروەردەکردنی منداڵ هەر لە چرکە ساتەکانی لە دایك بوونییەوە دەستپێ دەکات.



## بەرکوڵ

ئەم بابەتەی لەبەردەستدایە، توتژینەوەیەکی زانستی، سایکۆلۆژی یا سۆسیۆلۆژی نییە زانیاری پێشوەختی گەرەك بێت.

دەرئەنجامی ئەزموونەکانی تاقیگەیەك یا تیۆرییەکی هەم ئاهەنگ نییە تاکە کەسێك یا چەند کەسێك دۆزیبێتیانەوە، بەڵکو ئەزموون گەلێکن زادەی پراکتیزەکردنی پرۆسەی پێگەیاندنی منداڵ.

ئەم شێوازەش لانی کەم چەند خاڵی گرینگ وەخۆدەگرێت کە پێویستە هەر دایك و باوکێك یا هەر سەرپەرشتێك لە هەگبەکەی داهەبێت:

حەوسەلە و لەسەرەخۆیی، زانیارییەکی مام ناوەندی، وردبوونەوە لە هەر رەفتارێکی خۆی و منداڵەکەی. کەش و هەوای خانەوادە و کۆمەڵ. بەگشتی ئەم شێوازە بە دوو رێبازی تەریبدا تێدەپەرێت. ئامۆژگاری و راهێنان. دەبینین ئەم پرۆسەیە پتر لە مەشق کردن دەچێت کە خودی سەرپەرشت دەبێ کردە کە ئەنجامبدات ئەوسا وەرزشکار لەسەر ئەو نموونەیە خۆی رابێنێت. کەواتە (کورد گووتەنی: گەورە ئاوێ دەرێژێ و گچکە پێی تێدەخا) دەقی پراکتیکی پێگەیاندنە.

بەرواڵەت ئەرکێکی ئاسانە وەلێ بێ ماندبوون نییە، چونکە پێشی هەموو شتێك دەبێ پەروەرکار بە خۆیدا بێتەوە. منداڵ وەك تابلۆیەکی سپی وایە چۆنیەتی نەخشاندنی لە کۆنترۆڵی نیگارکێشدایە ئەم تابلۆیەش تەنیا پەرەیەك نییە، بەڵکو پەردەیەکی فۆتۆگرافیشە بێ ئاگا هەموو رەفتارەکانی تۆو دەوروبەرت تۆمار دەکا کەواتە هەر هەنگاوێك پارێزی دەوێ. لێرەدا شتی

مەحاڵ نییە، چۆنت بوێ دەتوانی ئاوا منداڵەکەت باربێنی..... درێژدادڕی ناوێ، تۆ چیت منداڵەکەت تۆی سبەینێیە، ئیتر.....

**ئاوێ بێنە و دەستان بشۆ**

**وەرگێڕ**



## دەربارەی منداڵان

پەروەردەکردنی منداڵ بەشێکی پڕبایەخی ژیانی ئێمە پێکدێنێ. منداڵان بنیاتنەرانی دوارۆژی وڵاتەکەمانن، مێژوو دەخولقێنن، دایك و باوکانی ئایندەن، دواتر بارهێنەرانی منداڵانی خۆیانن، کەواتە پێویستە وەك هاوڵاتیەکی بەزبیك و دایك و باوکی باش باربێن. منداڵەکانمان داردەستی پیریمانن، ئەگەر بە باشی باربێن لەبەریان دەحەسێتەوە، خراپ باربێن پیریمان پێتاڵ دەکەن، ئەوسا لە بەرامبەر خەڵك و خۆشمان گوناهبار دەبین.

دایك و باوکانی خۆشەویست پێویستە بایەخی بارهێنان و مەزنی ئەم بەرپرسییە بزانن. پێش هەموو شتێك سەرنج بدەنە ئەم خاڵە کە بارهێنان گەلێك لە دووبارە پەروەردەکردنەوە ئاسانترە. حاملاندنی لە باری منداڵ هێندەش سەخت نییە ئادەمیزاد نەتوانێ وەئەستۆی بگرێ، بەڵکو لە دەست هەر دایك و باوکێك دێت، هەر کەس بیەوێت دەتوانێ منداڵەکەی پەروەردە بکات. جگە لەوەش کارێکی لە بارو بەتامە، وەلێ دووبارە پەروەردەکردنەوە بابەتێکی تەواو جیاوازە.

ئەگەر منداڵەکەت خراپ بارهێناوە یاکەمتەرخەمیت کردووە یا لەبەر تەمبەڵیت بەرەڵڵات کردووە و گوێت نەداوەتێ ئەوا بۆ پەروەردەکردنەوەی دەبێ زۆربەی کارەکان سەر لەنوێ دەسپێ بکەیتەوە. چاککردن و دووبارە حاملاندنەوە کارێکی ئاسان نییە، زانیاری و سەبر و حەوسەلەی گەرەکە، کە رەنگە لای هەموو دایك و باوکێك دەسنەکەوێت. زۆر خێزان هەن نەیاتوانیوە لە پەروەردەکردنەوەی منداڵەکەیاندا سەرکەتووبن، چونکە خراپ بارهاتوون و ئەمەش لە ژیانیاندا سەقامگیربووە. دیسانیش پەروەردەکردنەوەیان کارێکی ئەستەم نییە بەو مەرجەی وەك مرۆڤێکی کامڵ مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ. وەلێ دەبێ بزانن لە پرۆسەکەدا چ شتێکیان هەڵبواردووە. خۆ ئەگەر هەر لە سەرەتاوە باش پەروەردەکرابا تامیشی

له ژیان دەکردوو خۆشبەخت دەبوو. پەروەردەکردنەوە جگە لەوەی دژوارە خەم پەژارەشی بە دواوەیە. ئەگەر سەرکەوتنیشی تیدا دەستەربکرێ هەمیشە بۆ دایك و باوك دەردەسەری دەبێ، مێشکیان ماندوو دەکات و گیرو گرفتی دەروونیان دێنێتە پێش.

زۆربەی هەڵەکانی خێزان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گوێنادەنە ئەو سەردەمەی تێیدا دەژین. دەبینی دایك و باوك لە شوێنی کاریان هاولاتیەکی باش و بەکەڵکن، کەچی لە ماڵی بە بیر و باوەڕی کۆنەوە دەژین. ئەمەش بەو مانایە نییە کە هەموو شتێکی کۆن خەراپە، نا هەرگیز بەڵکو ئێستاش هەنە برەویان لە دەست نەداوە، وەلێ دەبێ هەمیشە ئەوەمان لەبەر چاوبێ کە ژیانی ئەمڕۆ لەگەڵ رابردوو جیاوازە. دەبێ منداڵەکانمان بۆ بنیاتنانی ئایندە چالاك و وریا بارێین، خێزانی ئێستا و خێزانی کۆن لەگەلێك بواردا لێکدوورن. ئەوسا باوك بالادەست بوو کەس زاتی نەدەکرد سنوور ببەزێنێ. دەمارگیرانیش لاگیریان دەکرد. ئەمە رەوشەش بۆ کۆمەڵگای ئەو کاتە بەکەڵك بوو. بەڵام ئێستا خێزان رەنگ و بۆیەکی دیکەی هەیە. ئەو سەردەمە بەسەرچوو کچ چاوەڕوانبێ کەسێك بێتە خوازبێنی، یا هاوسەری بۆ بدۆزنەوە. خێزان دەبێ تەنیا رێنوێنی و سەرپەرشتی منداڵەکەی بێت، ئەمەش بەداب و نەریتی کۆن مەیسەر ناکرێت دەبێ رێبازی نوێ بگرێتەبەر.

لە کۆمەڵگای بەرێ هەر خێزانێك سەر بە چینێکی تایبەت بوو، منداڵانیش هەر بۆ ئەو توێژە دەگەڕانەوە، منداڵی جوتیار هەر جوتیارو، منداڵی کرێکار هەر کرێکار دەردەچوو. وەلێ ئەمڕۆ مەیدانێکی پان و بەرین هەیە بۆ هەڵبژاردنی جۆری پیشە، لەم هەڵبژاردنەش ماڵ و دارایی کەمتەر دەور دەبینێ. دەورگێران دەگەڕێتەوە بۆ توانا و لێهاتوویی. باوکان و منداڵانیش ئەم راستیە دەزانن کە منداڵانی ئەمڕۆ هەل و مەرجێکی ئەو تۆیان بۆ رەخساوە کە لەگەڵ رابردوو بەراورد ناکرێت، ئەم سەرپەرشتیەی جارانی باوك نەماوە. هەر باوکێك هەنووکە



دەتوانێ تەنیا رابەرێکی وردبین و بە پارێزبێت، چونکە ئەمڕۆ خێزان تەنیا خێزانی باوکسالاری نییە. ئەگەر ژیان لەگەڵ رابردوو بەراورد بکرێن مافگەلێکی زۆرتریان هەیە.... خێزان پاشکۆی دەسەلاتی باوك نییە چونکە لە ژێر چاودێری کۆمەلایەتییدایە. لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا مافی باوکان مافگەلێکی دیاری کراویان هەیە. لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێش:

ئەم مافانە لە کوێوە سەرچاوەیان گرتووە؟

پێشوو وایان بیردەکردەوە دەسەلاتی باوك لە ئاسمانەو هاتووە، یا رێزگرتنیان لە خواوەیە، ئوسقوفەکانی کلێسا لەم بارەوە بۆ منداڵانی قوتابخانەکان دەدوان و دەیان داستاتیان دەهۆنیەوە کە ئەگەر منداڵان رێزی باوکیان نەگرن خواوەند سزایان دەدات، وەلێ ئێمە منداڵان فریو نادەین. لە بری ئەوە ئەمڕۆ باوکان لە ئاست کۆمەڵ و یاساکانی بەرپرسن.

لەم رووەوە دایکان و باوکانی ئەم سەردەمە گەلێك بە دەسەلاتن و پێویستە لەناو ماڵدا دەسرۆیشتووبن. هەر خێزانێك وەك یەکەیەکی کۆمەلایەتی لە دوو بەشی جیاواز پێکهاتووە یەکیان رابەرە ئەویتریان پەروەردە دەکرێ، پێویستە هەردووکیان لەسەر خێزانەکەیان کاریگەربن، ئەمەش واقیعبینی تەواوی گەرەکە. هەر کەس دەبێ ئەوە بزانی لە ماڵیدا سەرۆك نییە فەرمانەکەێ بێ پێچ و پەنا جێبەجێ بکرێ، بەڵکو ئەندامێکی بەرپرسە و خاوەنی مافی کۆمەلایەتی خۆی. ئەگەر ئەم بڕوایە دەرکبکرێ هەموو کارەکانی پێگەیاندن بە باشی بەڕێوە دەچن. دیارە ئەمەش لە هەموو خێزانێکدا وەك یەك نییە. ئەم پرسەش کەلێك هۆکار و بەڵگەی هەیە کە بە چۆنیەتی شێوازەکانی پەروەردەکردنەوە بەندن. وەلێ هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتە و پەروەردە بوونی خودی خێزانەکە. تا ئەندازەیەکیش پێکهاتەی خودی خێزان لە دەسەلاتی ئێمە دایە. بۆ نموونە پەروەردەکردنی تاقانە چ

کچ و چ کوڕ گەلێك دژوارترە لە پەروەردەکردنی چەند منداڵ بەیەکەوە. خێزان لە هەر بارودۆخێك دابێت. بە تایبەتی ئەگەر نەدار و دەستکورتبێ نابێ نازی تاقانەکەی بکێشێ و ببێتە جێگەی سەرنج و بایەخپێدان. ئەم نازکێشانە ئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە، ئەوسا خۆشەویستی دایك و باوەك دەبێتە حاڵەتێك لە قین و تووڕەیی. نەخۆشی یامردنی ئەو تاقانەیە خۆی لەبەر راناگیرێ و ترسی ئەم کارەساتە هەمیشە لە بیر و هۆشی دایك و باوکدا دەبێت و ئۆقرەیان لێهەڵدەگرێت. زۆر جاران ئەو تاقانەیە خوو بە تاکایەتی و کەسایەتی خۆیەوە دەگرێت و دەبێتە تاکە دەسەڵاتدار و ستەمکاری واقیعی خێزانەکە. دایك و باوکی تاقانە زۆر بە زەحمەت دەتوانن یا ناتوانن پێش بە سۆز و خۆشەویشتی خۆیان بگرن. ئەوانە بیانەوێ یانەیانەوێ منداڵێکی خۆپەرست لە داوێنی خۆیاندا باردێنی.

تەنیا لە نێو خێزانی فرە منداڵ خۆشەویستی دایك و باوك دۆخێکی سروشتی وەخۆ دەگرێ. ئەم خۆشەویستیە یەکسان بەسەر منداڵەکاندا دابەش دەبێت، ئەوانیش هەر لە سەرەتاوە خوو بە هاوکاری کردنەوە دەگرن. لە پەیوەندییەکانیاندا دەبنە خاوەن ئەزموون. بوونی منداڵی تەمەن جیاواز دنیایەکی ئەوین و خۆشەویستی دەخولقێنێ، ژیانی منداڵ لەوێدا دەبێتە بەستن و پەیڕەوکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کۆمەڵێك ئادەمیزاد لە قۆناغی جۆراو جۆری تەمەندا. ئەم منداڵانە رووبەری پرسی کۆمەڵایەتی ئەو تۆ دەبنەوە کە بۆ منداڵی تاقانە نارەخسێ. لەوانە پەیوەندی لەگەڵ برا گەورە و برا بچووك کە شێوەی پەیوەندییەکانیان لێکجیان. منداڵ خوو بەمجۆرە پەیوەندییەوە دەگرێت.

خێزانێکی گەورەی فرە منداڵ بۆ هەر هەنگاوێك وەك یاریکردن منداڵ بەرەو هاوکاری کۆمەڵایەتی دەبات، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بۆ پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی گەلێك گرینگە. ئێمە لەم بارەوە نادوێین. بەڵکو زۆر بابەتی دزێو دێتە پێش بە تایبەت ئەو کاتەی دایك و باوك لێك جیادەبنەوە رەنگدانەوەیەکی تراژیدی



لە مەڕ پەروەردەکردنی منداڵەکان دەبێت. زۆر جاران ئەوانن دەبنە هۆکاری بەریوانی و ئاشتکردنەوە. ئەو دایك و باوکانەش کە بە ئاشکرا لە یەکتری بێزارن ناتوانن ئەم هەستەیان لە منداڵەکان بشارنەوە.

ئەگەر هۆکارگەلێك هەبوو بۆ لێکجیابوونەوەیان پێویستە بیر لە منداڵەکانیان بکەنەوە. دەکرێ هەر ناتەبایەك بە ئەدەب و نزاکەتەوە چارەسەربکەن و ناتەبایی و بێزاری خۆیان لە منداڵەکانیان بشارنەوە.

ئەو بارکەی ماڵ و منداڵی بەجێهێشتووە و پەروەردەکردنی منداڵەکانی بە دایکیان سپاردووە لە دوورەوە منداڵەکانی بحاملێنێ چونکە هەرگیز هۆکارێکی پۆزەتیڤ نابێت، باشتروایە لە بیر خۆیان بەرێتەوە، تەنیا ئەرکی سەر شانی خۆی لەمەڕ یارمەتی دارایی وەئەستۆ بگرێ.

پرسی پێکهاتەی خێزان پرسێکی گرینگە مامەڵەی ژیرانەی گەرەکە. ئەگەر دایك و باوك منداڵی خۆیان خۆشبوێت بیانەوی باش پەروەردەیان بکەن دەبێ هەوڵ بدەن ناتەباییەکانیان نەگاتە ئاستی تەقینەوە تا منداڵەکانیان نەکەونە بارودۆخێکی ئاستەنگدار. پرسێکی تر کە پێویستە بایەخی تەواوی پێبدرێ ئامانجی پەروەردەکردنە. لە هەندێك ماڵدا دایك و باوك پێکەوە دەژین و بە هیوان هەموو شتێك بە خێرو خۆشی تێپەڕێ، لە کاتێکدا نەئامانجێکیان هەیە نەبەرنامەیەك بۆ ژیان، دوایی کەوە هۆش خۆیان دێنەوە دەبنین چ منداڵێکی سەر لێشواویان لە داوێنی خۆیاندا پەروەردەکردووە، دەشزانن ئەگەر ئامانج ئاشکرا نەبێت هیچ کارێك بەئەنجام ناگات. ئەوانە دەبێ بزانن چۆن منداڵەکەیان بحاملێنن، ئایا دەیانەوێ وەك مرۆڤێکی راستەقینە روویا، یرئنرژی، ئابروومەند، بەوەفا بۆ کۆمەڵ و نەتەوەکەی عاشقی کار، لێهاتوو، بە ئەدەب پەروەردەبکەن؟ یا دەیانەوێ کەمتەرخەم چاوچنۆك، ترسنۆك و فێڵباز باربێ؟.

هەمیشە ئەوەتان لەبەرچاو بێت کە ئێوە لە پێناوی خۆشی و شادی خۆتان کوڕ یا کچتان نەبووە، لە ژێر باڵی ئێوە لە ژێر چاودێری رابەرایەتی ئێوە هاوڵاتیەك رۆڵەیەکی کورد بوونەوەرێکی چالاك، بنیاتنەرێکی دنیایی داهاتوو پەروەردەبێت. ئەگەر هەڵەبکەن بەد بەختیەکان تەنیا بەخەی ئێوە ناگرینەوە. بەڵکو داوێنی خەڵك و سەرتاسەری کۆمەڵگا دەگرن. خۆتان لەم پرسە مەبوێرن وامەزانن شتێکی عەقلانی و پاساو هێنانەوەیەکی تراژیدابیە. ئەگەر لە کارخانە، دەزگا، بائەو شوێنەی کاری لێدەکەن لە بری بەرهەمێکی باش بەرهەمێکی خراپ دروستبکەن شەرمەزار نابن؟ شەرمەزارتر لەوە ئەوەیە رۆڵەیەکی بێکەڵك و خراپ ئاراستەی ناودیوی کۆمەڵك بکەن.

ئەم پرسە گەلێك بە نرخە هەر ئەوەندە بەخەستی بیری لێبکرێتەوە چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە، ئەوسا لێداوان لە پەروەردەکردن زیادە دەبێت. ئێوە دەزانن چیبکەن باشە تا بە نیازتان بگەن، زۆر لە دایك و باوکان بە باشی بیری لێناکەنەوە، تەنیا ئەوەندە دەزانن منداڵەکانیان خۆشبوێ و شانازی ببە بوونیانەوە بکەن، وەلێ لە بیردەکەن رۆڵەیەکی کورد لە پاوانی بەرپرسی ئەوان دایە. ئایا باوکێك کە خۆی رۆڵەیەکی بەئەمەکی گەلەکەی نەبووە و گوێی نەداوەتە پێگەو ژیان و کاروباری وڵاتەکەی، دڵی پێیەوە نەبووە، نەخشە و پیلانی دوژمنان نەیهەژاندووە چۆن دەتوانێ بیر لە پرسەکانی پەروەردەکردن بکاتەوە. هەن ئەو کەسانەی لە شوێنی کارو ناو خەڵك خۆیان بە کوردپەروەر لە قەڵەم دەدەن بەڵام لەگەڵ کردەووەو رەفتاری ناو خێزانیان یەکناگرێتەوە. کەواتە پێش ئەوەی هیچ کارێك ئەنجامبدەن پێویستە بە خۆیاندا بێنەوە. ناکرێ کاری ماڵ لە کاری کۆمەڵایەتی جوێبکرێتەوە ئەو شتانەی وەك ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵگا خۆشحاڵیان دەکات و هەرچی لە دڵ و دەروونیان دایە، هەرچی بیری لێدەکەنەوە پێویستە منداڵ لێی ئاگاداربێ. دەبێ منداڵ شانازی بە پێگە و خزمەتگوزایتان لەناو کۆمەڵدا بکات. ئەم شانازی کردنە



کاتێك بەجێیە کە واقیعی کۆمەڵایەتیان بۆ منداڵەکەتان روون بێت، با بە تەنیا بە جل و بەرگ و ماشێن و تفەنگەکەی راوتانەوە نەنازێ. بە واتایەکی دی رەفتاری ئێوە فاکتەری دیاری کردنی سنووری پەروەردەکردنە، پێتان وانەبێ ئەو کاتەی لە گەڵی دەدوێن، فێری دەکەن، فەرمانی پێدەدەن پەروەردەی دەکەن، بەڵکو هەر چرکەساتێکی ژیانتان پەروەردەکردنن، بگرە ئەو کاتەی لە ماڵەوەش نین، چۆن جلەکانتان دەپۆشن، چۆن لەگەڵ خەڵك دەدوێن، چۆن لە بارەی خەڵکەوە دەدوێن، چۆن شاد باغەمگین دەبن، چۆن لەگەڵ دوژمنەکانتان دەجوڵێنەوە، چۆن پێدەکەنن چۆن رۆژنامە دەخوێنەوە، ئەوانە هەموویان بۆ منداڵ گرنیگن، گۆڕانی ئاهەنگی گفتوگۆت، لادان لە بیرو بۆچوونەکانت، هەموویان هەست پێدەکا وەلێ ئێوە هەستی پێناکەن، کاتێك توڕە و خۆپەرستی و کردەوەکانت شایستە نین، یادایکیان ئازار دەدەیت، یا ئەگەر دایکیت و هاوسەرێکی خراپی، ئەو چاوەڕوانی باش پەروەردە بوونی منداڵەکەت مەبە، تۆ بەکردەوە خەریکی منداڵەکەت خراپ باردێنی، ئیتر هیچ رینوێنیەك و بابەتێکی پەروەردەکردن ناتوانێ یارمەتیت بدات.

زۆر جار دایك و باوك بە دوای میتۆد یا نموونەیەکدا دەگەرێن کە بە پێی ئەو نموونەیە منداڵەکەیان پەروەردە بکەن. پێیان واتەیە ئەم نموونەیە بدرێتە دەست هەر کەسێك دەتوانێ بەباشی منداڵەکانی پێ بمابی ملێنێ. ئەگەر کەسایەتی خۆت کەم و کوڕی هەبێت هەرگیز موعجیزەیەکی ئاوا روونادات لەم رووەوە دەبێ ئەوەمان لە بیر بێت نەمعجیزە نەچاو بەستەکی لە بواری پەروەردەکردندا نین. هەرگیز کەسێکی خراپ و ناتوانێ منداڵی باش بارێنێ. هیچ کردەوەیەکی دایك و باوك هەرچەندە وردیش بێت لە منداڵ وون نابێ و بێ کارتێکردن نییە.

بەداخەوە هێندێك بڕوایان بە هەڵخەڵەتاندن هەیە، هێندێك لیدان و تەمبڵی کردن بە راست دەزانن. هێندێك دڵخۆشکردن و خەڵات پێدان، هێندێك بە هەموو

تونایانەوە هەوڵ دەدەن ماڵەکەیان برازێننەوە تا منداڵەکەیان سەرگەرم بێت، هێندێك بە بەڵێن و بەڵێن کاری منداڵەکەیان رام دەکەت.

پەروەردەکردن رتمێکی تەواو جیدی لە هەمانکاتدا زۆر سادە، رامت و دروست و دڵسۆزی گەرەکە. ژیانی ئێوە دەبێ بەم هەڵ و مەرجە هەوێن بکرێت، درۆزنی و خۆهەڵکێشان شێوازی پەروەردەکردن دەشێوێنی، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ مرو مۆچ و پەشێوبن، راستگۆ و دڵسۆزبن، هەوڵبدەن بارودۆختان لەگەڵ پێگەو چوارچێوەی ماڵەکەتان یەکبگرێتەوە.

زۆر دایك و باوك لە دەست کەمی کات دەناڵن، کارێکی باشە پتر لەگەڵ منداڵ دابن، خۆ ئەگەر بەشێك لە کاتی خۆتان بۆ منداڵەکەتان تەرخان نەکەن ناکرێت. وەلێ پێویست ناکات هەمیشە لە ژێر چاودێری بێت و بەدرێژایی شەو رۆژ لەگەڵێدابن، ئەمە لایەنی نیگەتیڤی کەسایەتی منداڵ بەهێز دەکات. ئەم جۆرە منداڵانە گەشەی رووحیان خێرادەبێت، هەڵسوکەوت لەگەڵ گەورەکان بۆیان دەبێتە خوو. دایك و باوکان شانازی پێوە دەکەن وەلێ دواتر دەردەکەوێ هەڵەیەکی گەورەیان کردووە.

باشترە بزانن منداڵەکەتان چیدەکات لەگەڵ کێ دەگەڕێ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئازاد بێت تەنیا لە ژێر کاریگەری کەسایەتی ئێوەدا نەبێت، بابکەوێتە ژێر کارلێکی فرە لایەنی ژیان. لە هەمانکاتدا لە کارتێکردنی نێگەتیڤ رق و کینە دوور بخرێتەوە. لە ژیاندا ناچار دەبێت لەگەڵ فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لەگەڵ کەسایەتی جۆرا و جۆر و نامۆ رووبەڕوو بێت، پێویستە بە جۆرێکی ئەو تۆ پەروەردە بکرێت بتوانێ لەمانە تێبگا و خەباتیان لە دژبکات تا لە جێگای خۆیدا لێیان شارەزا دەبێت. لە پەروەردەکردنی داخراوە گۆشەگیر و دوور لە خەڵك ناکرێ تۆوی ئەم کارە



بچێنرێ، هەڵکردن و تێکەڵ بوون لەگەڵ کەسانی جۆرا و جۆر شتێکی ئاساییە بەڵام نابێ هیچ شتێك لە ژێر چاودێری دوور بخرێتەوە.

دەبێ لە کاتی پێویست و لە شوێنی خۆیدا یارمەتی منداڵ بدرێت و رێنوێنی بکرێت. بەم پێیە ئەرکی ئێوە تەنیا رابەری و رێنوێنی بەردەوامە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ دەستی بگریت و هەمیشە بە جێگە ئەو بیربکەیتەوە و کارەکانی بۆ ئەنجامبدەیت.

بۆ ئەوە لە کات بدوێین هەڵوێستەیەك لەسەر باسەکەمان دەکەین، بۆ پەروەردەکردنی منداڵ کات و سات زۆر پێویست نییە، وەلێ کەڵك وەرگرتن لە کاتی کەم بایەخدارە.

جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە پەروەردەکردنی منداڵ هەتا ئەو کاتەی لە ماڵەوەش نیت بێ پسانەوە درێژەی هەیە. واقیعیەت رووتی پەروەردەکردن هەرگیز پەیوەندی لەگەڵ گفتوگۆ و کارتیکردنی راستەوخۆی منداڵەکەتدا نییە، بەڵکو لەگەڵ ئەو پێکهاتەیی لە ماڵەوە، وەدیت هێناوە، بە کەسایەتی خۆت و یەکبوونت لەگەڵ کۆمەڵ، بە جۆری ژیانی منداڵەکەت بە چۆنیەتی سەرپەرشتی کردینەوە بەستراوەتەوە، ئەمەش فاکتەری چکۆلە یا بێ نرخی تێدانییە. نابێ هیچ فاکتەرێك پشت گوێ بخرێ یا بێ بایەخ لە قەڵەمبدرێ تە تەڵەکردنی فاکتەرەکان وەك فاکتەری بە نرخ و بێنرخ، گرنگ و بێ بایەخ، گوێدانە هێندیکیان پشگوێ خستنی ئەوانی تر هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە هیچ شتێکی بچووك و بێکەڵك لە پرۆسەی پەروەردەکردندا بەدیناکرێ. ئەو قژگیرەی بەسەری منداڵەکەتیەوە دەکەیت. ئەم کڵاوە یا ئەو بووکەڵەیە هەموویان لە ژیانی منداڵەکەتدا دەوریان هەیە. پێکهاتەی رێکوپێك لەسەر ئەم بنەمایە دادەنرێ کە نابێ بچووکترین شت پشتگوێبخرێ. ئەم

وردە کاریانە بێپسانەوە کاریگەرن، هەر لەسەر ئەمانە بناغەی ژیان دادەمەزرێت. رابەری و رێکخستنی ژیان ئەرکێکی پرلیپرسینەوەیە.

بەکورتی: دەبێ هەوڵبدرێ منداڵ باش پەروەردە بکرێ بۆ ئەوەی لە دواییدا ناچارنەبین دووبارە پەروەردەی بکەینەوە، چونکە ئەمەی دواییان کارێکی زۆر سەخت و گرانە.

ئێوە رابەری خێزانە نوێیەکەتانن تا دەتوانن دەبێ خەسڵەتەکانی بناسن و هەوڵبدەن پێکهاتەیەکی رێکوپێکی هەبێت. گومانی تێدانییە بۆ پرۆسەی پێگەیاندن دەبێ ئامانجێکی دیاریکراو بەرنامەیەکتان هەبێت. ئەوەتان هەمیشە لەبەرچاو بێت کە منداڵەکەتان تەنیا دەستمایەی سەرگەرمی و شادمانیتان نییە بەڵکو هاوڵاتیەکی داهاتووە، لە بەرامبەر نیشتمانەکەتدا بەرپرسی. پێش هەموو شتێك پێویستە خۆت هاوڵاتیەکی چاك و کوردپەروەر بی، ئینجا ئەم هەستە بگەیەنیت بە خێزانەکەت، بە وردی وریایی ئاکارت بە -پشت بە هیچ رێباز و کردەوەی ساختە مەبەستە- سادە و راست و رەوان بە.



## دەسەڵاتی دایك و باوك

لە باسی پێشوودا وتمان خێزانی ئەمڕۆ لە زۆر رووەوە لەگەڵ خێزانی رابردوودا جیاوازە. ئەم جیاوازیە پتر لە دەسەڵاتی ناو خێزانی دایك و باوکدا بەرچاودەکەوێ. دایك و باوکانی ئێمە دەسەڵاتی تەواو یان لە لایەن کۆمەڵگاوە پێدراوە، کە بتوانن هاوڵاتیەکی تەواو رێك و پێکی داهاتوو باربێنن. لە بەرابەر گۆمەڵگادا بەرپرسن لە روانگەی منداڵەوە دەسەڵاتیان لەسەر ئەم بناغەیە. وەلێ لەناو خێزان لەبەردەم منداڵدا نیشتاندانی ئەم دەسەڵاتە و بەم سەربەستیەی کۆمەڵایەتی خەم ساردی لێدەکەوتەوە و ناجوانە. ئەو کاتەی پەروەردەکردنی منداڵ دەست پێدەکات سەلماندنی لۆجێکی و نیشاندانی مافە کۆمەڵایەتییەکان کارێکی شیاوین. لە هەمانکاتدا راهێنەر یا بارهێنەر ناتوانی بێدەسەڵات بێت، بەم پێیە دەسەڵات و زاڵبوون لەوەدایە کە پێویستان بە سەلماندن نەبێت. ئەم دەسەڵاتە لە لێوەشاوەیی گەرەکە نەك سەپاندن. زۆرجار ئەو پرسیارە دێتە پێش ئەگەر منداڵ گوێ رایەڵ نەبێت دەبێ چی بکەین؟ خودی ئەم واژەیەی (گوێ رایەڵ نەبوون) لە روانگەی منداڵەکەوە بێدەسەڵاتی دەگەیەنێ.

دەسەڵاتی دایك و باوك لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ و دەبێ چۆن بێت؟

دایك و باوکی ئەو منداڵانەی گوێ رایەڵ نین پێیانوایە دەسەڵاتی دایك و باوك شتێکی سروشتییە و لە ژات و نیهادی ئەوان دایە، کاتێکیش توانەیەکی رەگەزی ئاوا نەبێت ئەوا هەر هەوڵێك بێهوودەیە، تەنیا ئەوەیان بۆ دەمێنێتەوە ئێرەیی بەو کەسانە بەرن کە ئەو توانایانەیان هەیە. ئەوانە بە هەڵەداچوون، وەدەستهێنانی دەسەڵات لەهەر خێزانێك دەگونجێ و پرۆسەیەکی سەخت نییە.

هێندێك وادەزانن دەسەڵات لەسەر درۆدا دەمەزرێت، تەنیا مەبەستیشیان ئەوەیە منداڵەکەیان گوێ رایەڵ بێ و بەس، ئەمە لە واقیعدا هەڵەیە، دەسەڵات و گوێ

رایەڵی نابنە ئامانجی کار. ئامانج تەنیا یەك شتە ئەویش پەروەردەکردنی راست و دروست. گوێ رایەڵیش یەکێکە لە رێگاکانی وەدەستهێنانی ئەم ئامانجە. دایکاکان و باوکان بیر لە ئامانجی واقیعی ناکەنەوە ئەوان گوێ رایەڵیان وەك خودی گوێ رایەڵی دەوێت و وادەزانن بە ئامانج گەیشتوون. بە توێژینەوەی ئەم بابەتە هەمیشە بەو ئەنجامە دەگەین کە نە ئاسودەیی نە گوێ رایەڵی درێژخایەن نین، ئەو دەسەڵاتەی لەسەر درۆ بنیاتنراوە تەمەنی کورت دەبێ بە زوویی هەموو شتێك تێکدەچێت ئەوسا دەسەڵاتی باوك و دایك و گوێ رایەڵی منداڵ ئاسەواریان نامێنێت.

هێندێك جار دایك و باوك لە پرۆسەی گوێ رایەڵی منداڵدا سەرکەوتوو دەبێ بەڵام لایەنەکانی تر پەروەردەرکردنی وەلادەنێی، ئەمەش کەسایەتی منداڵەکە لاواز و لە رزۆك دەکات.

دەسەلاتگەی ساختەهەن ئێمە لێرەدا بە ژمارە لە (نۆ) شێوازیان دەکۆڵینەوە هیوامان وایە دوای ئەم لێکۆڵینەوەیە بتوانین روونی بکەینەوە دەسەڵاتی واقیعی دایك و باوك لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ.

**۱- بەهۆی تۆماندن**

ئەمە هەر چەند زیانبارترینیان نییە بەڵام ترسناکترین شێوازی بە دەستەوەگرتنی دەسەڵاتە. ئەم شێوازە پتر ئازادی باوك دەدات، چونکە دەبێ هەمیشە تورە و بێ و بۆڵەی بێ بۆ هەر شتێکی بچووك بتەقێتەوە، لەهەر درفەتێکی لە بار یا نالەباردا دەست بۆ شەلاق و داردەست بەرێ، و هەر پرسیارێك بەرەقی و هەرتاوانێك بە تەمبێ کردن وەڵام بداتەوە، ئەمە هەمان شێوازی گوشارخستنەسەرە بۆ وەدەست خستنی دەسەڵات. زەبر و زەنگی باوك تێکرای خێزانەکە دەگرێتەوە، تادەگاتە دایك. ئەم شێوازەش نەك لە رووی ترساندنی منداڵەکەوە زیان بەخشە لەم رووەوە



پێگە دایك و لە خێزاندا دەکاتە سفر واتە هیچ. باوای لێدەکات تەنیا شایستەی خزمەتکاری بێت. ئەم شێوازە هیچ لایەنێکی پەروەردەکردن ناگرێتە خۆی نەك هەر پاڵ بە منداڵەوە دەنێت خۆی لە باوکی بشارێتەوە بەڵکو فێری درۆی منداڵانە و ترس و لەرزیشی دەکات، لە هەمانکاتدا تۆوی زەبر و زەنگ لە دەروونی منداڵەکەدا دەچێنێ، وەك منداڵانی فەرامۆش کراو، یا لە داهاتوودا کەسایەتی پووچ بێ ناوەڕۆك باردێت، یا کەسایەتی سەرکیش کە بە درێژایی تەمەنیان خوازیاری تۆڵە سەندنەوە دەبن... ئەم شێوازە تەنیا لای دایکان و باوکانی دواکەوتوو هەیە کە بە خۆشحاڵییەوە ئێستا خەریکە لەناودەچێ.

**۲- بەهۆی دووره پەرێزی لە منداڵ**

هێندێك دایك و باوك وایان پێباشە خۆیان لە منداڵەکەیان دووربگرن و کەمتر لەگەڵی بدوێن یا ئەگەر لەگەڵی رووبەڕووبوون وەك فەرماندەیەك بدۆین. ئەم شێوازە لە هێندێك خێزانی کۆندا هەیە، باوك ژوورێکی خۆیی هەیە وەك تاکە شەخصی پیرۆز خۆی دەنوێنێ.

نان خواردن و خۆشیەکانی جژێن، فەرمانەکانیشی لە رێگەی دایکیانەوە دەگەیەنێنە ئەندامەکانی خێزان. دایکانیش هەن ژیانێکی تایبەت بە خۆیان رەخساندووە بیر و بۆچوونی تایبەتیان هەیە، لەبەر ئەوە منداڵەکانیان یا لە ژێرچاودێری دایە گەورە یا لە ژێر دەستی خزمەتکاران باردێن. دەسەڵاتێکی ئاوا نەك هەر هیچ قازانجێکی نییە بەڵکو خێزانێکی سەلامەت باناهێنێ.

**۳- بەهۆی خۆهەڵکێشانەوە**

ئەمەش جۆرێکی تایبەتی دەسەڵات بەدەستەوە گرتنە لە رێگەی دوورەپەرێزی لە منداڵ بەڵام لەویش زیانبارترە. زۆر کەس وا خۆیان وێنادەکەن کە چالاکترین و گرینگترین پیاوی وڵاتن، لەبەرچاوی منداڵەکەیان خۆیان هەڵدەکێشن، لە ماڵەوە

شانازی بە خۆیانەوە دەکەن و لە لێهاتوویی خۆیان دەدوێن. بە خۆ بە زلزانی لەگەڵ خەڵك رووبەڕووی دەبن. زۆرجار دیتراوە منداڵان دەکەونە ژێر کارتێکردنی ئەم جۆرە باوکانە و دەست بە شانازی و خۆهەڵکێشان دەکەن، لەگەڵ هاوەڵەکانیان رەفتاری جیاواز دەنوێنن. بە دەستەواژەی پێاهەڵکالان و دووبارەکردنەوە دەڵێن: باوکە گیان، لێپرسراوە، نووسەرە، رابەرە، ناودارە، ئەم هەڵسوکەوتە لە دایکانیش دەبنرێ: ئەو کراسەی تایبەت بە فلان مەراسیم، ئەو سەفەرەیان بۆ فلان هاوینەهەوار. فلان گەڕاو .... شتگەلێکی تر بۆ خۆهەڵکێشان و لە خۆرازیبوون، خۆ جوێکردنەوە لە خەڵکی تر هەتتا لە منداڵەکانی خۆشیان.

**٤- بە هۆی لەخۆباییبوون**

لەمە حاڵەتانەدا پتر گوێ دەدرێتە منداڵەکە. خۆیانی بۆ ماندوودەکەن وەلێ وەك دامەزراوەیەك رەفتاردەکەن، بڕوایان وایە پێویستە منداڵەکەیان بە وردی گوێبیستی هەر وشەیەکیان بێت. وتەکانیان کورت و پیرۆز وەربگرن. وەك فەرماندە فەرمان دەردەکەن. هەر کات بڕیارێکیاندا بێوەستان و ئەم لاو ئەوا ببێتە یاسا. ئەم دایك و باوکانە هەمیشە ترسی ئەوەیان لە دڵدایە نەکامنداڵەکانیان واتێبگەن دایك و باوکیان هەڵەن و خاوەنی کەسایەتیەکی پتەونین، ئەگەر باوکی وتی: (سبەی باران دەبارێ ناکرێ بچینەگەڕان) خۆ ئەگەر سبەی کەش و هەوا خۆشیشی بێت دەبێ وابیربکەنەوە گەڕان ناکرێ. یاباوکیان حەزی لە سینەما نییە. تازە قەدەغەیە منداڵەکان بچنە سینەما ئەگەر فیلەمەکەش خۆش بێت. لە منداڵەکەی دەدات و دوایی روون دەبێتەوە منداڵەکە هیچ تاوانی نەبووە، کە چی باوك هەر لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی سوورە پێیوایە کارێکی باشی ئەنجامداوە، لە هەر هەڵسوکەوتێکی منداڵەکەدا خاڵی تێکدانی نەزم دەبینێ و یاسا و فەرمانی نوێی بۆ دەردەکات. لە هەمانکاتدا ژیانی منداڵ،



قۆناغی گەشەکردنی و دڵخۆشیەکانی لەبەرچاو ناگرێ، جگە لە سوودمەندبوونی خۆی بۆ خێزانەکەی هیچ شتێکی تر نابینێ.

**٥- بە هۆی پەند و ئامۆژگاری**

لەم شێوازەدا دایك و باوك بە پەند و ئامۆژگاری و وتە گەلێکی بە کەڵك منداڵەکەیان تەنگەتاو دەکەن. لە بڕی ئەوەی بە گاڵتە و گەپ لەگەڵی بدوێن، دێن بەرامبەر خۆیان لەسەر چۆك دایدەنیشێنن دەست دەکەن بە ئامۆژگاری و وتاری خەماوی و دزێو. وتەگەلێکی پڕ لە ئەزموون و جوامێری دەرخوارد دەدەن. دڵنیام لەم جۆرە خێزانانەدا شادی و پێکەنین قاتە.

دایك و باوك هەوڵدەدەن وەك پیاو چاك خۆیان بناسێنن. وا لە منداڵەکەیان بگەیەنن کەسایەتیەکی دوور لە هەڵە و کەم و کوڕین. وەلێ لە بیردەکەن منداڵەکانیان گەورەکان نین، ژیانی تایبەت بە خۆیان هەیە و پێویستە رێزیان لێبگرێت. منداڵ هەستیار تر و کارلێکی پترە وەك گەورە نییە ئەقڵی بە هەموو شتێك بشکێت. راهێنان لەسەر بیرکردنەوە و ژیری دەبێ کەم کەم و ئارام لە منداڵدا وەدیبهێنرێ. ئامۆژگاری پەیتا پەیتا و درێژدادڕی دەبێتە هۆکارێکی نیگەتیڤ لەسەر دەروونی منداڵ.

**٦- بە هۆی خۆشەویستی بێسنوور**

ئەم دەسەڵاتە زۆرباوە لە هەمانکاتدا ساختەیە زۆر لە دایکان و باوکان پێیانوایە دەبێ منداڵان گەورەکانی خۆیان خۆشبوێ، بۆ ئەوەی شایستەی ئەو خۆشەویستییە بن دەبێ لە هەر هەنگاوێکدا خۆشەویستی خۆیان بۆ منداڵەکەیان دەربڕن، بەمەش بکەوێتە بەر بارانی واژەگەلی ئەوین و لاوەندنەوە و خۆشەویستی بێسنوور و رێزلێنان، خۆ ئەگەر منداڵەکە جارێك گوێڕایەڵ نەبوو خێرا لێیدە پرسن: کەواتە باوە گیانت خۆشناوێ: ئینجا لە چاوانی رادەمێنێ

چاوەڕوانی نزاکەت و خۆشەویستین، یا زۆر جار لەبەرچاوی منداڵەکەیان بۆ ئاشناکانیان بە منداڵەکانیان هەڵدەڵێن: باوەی زۆر خۆشدەوێ، هەموومانی خۆشدەوێ، منداڵێکی زۆر بە سۆزە.....

ئەم جۆرە خێزانانە بە جۆرێکی ئەوتۆ لە دەریای هەست و سۆزدا نقوم بوون کە تێبنی شتێکی دیناکەن. زۆر لە وردەکارییەکانی پەروەردەکردن دەخرێتە پشت گوێ، منداڵ زۆربەی کارەکانی کوێرانە لەسەر خۆشەویستی دایك و باوك ئەنجام دەدات.

لەم میتۆدەدا خاڵێکی مەترسیدار هەیە خۆپەرستی خێزان گەشەدەکات، منداڵ حەوسەڵەی ئەم سۆز و خۆشەویستە زۆرەیان نییە، هەر زوو تێدەگەن دەتوانن بە هەر شێوەیەك بیانەوێ دایك و باوکیان فریوبدەن. ئەمەش تەنیا تۆزێك نشاندانی سۆز و خۆشەویستی گەرەکە. هەتتا دەتوانن دایك و باوکیان بترسێنن، هەر ئەوەندە بەسە کەمێك نیوچاوانی گرژبکات و ئاسەواری ئەم سۆز و خۆشەویستیە نەهێڵێ. بەم پێیە منداڵ هەر لە منداڵیەوە تێدەگات دەتوانێ خەڵکی هەڵخەڵەتێنێ، منداڵێکی ئاوا لەبەر ئەوەی ناتوانێ بەم خەست و خولییە تیکرایی خەڵکی خۆشبووێت دوورنییە بەبێ ویست و ئارەزووی خۆی لەبەر هێندێك هۆکاری تایبەتی خەڵکی هەڵخەڵەتێنێ. زۆر جار ئەم خۆشەویستییە لە ئاست دایك و باوك زۆر دەمێنێتەوە و درێژەدەکێشێ وەلێ تێکرای خەڵکی لا دەبێتە نامۆ، هیچ هەستێکی خۆشەویستی و دۆستایەتی لەگەڵ کەس نابێت، ئەمەش خۆپەرستی لێدەکەوێتەوە. زۆر جار خودی دایك و باوك دەبنە قوربانی ئەم خۆپەرستی و لە خۆڕازی بوونە.

**٧- بە هۆی نەرم و نیانی بێسنوور**

ئەمە نابەجێ ترین جۆری دەسەڵات وەدەست هێنانە، گوێڕایەڵی و ملکەچی منداڵ لە ڕێگەی سۆز و خۆشەویستییەوە دابین دەکرێ. هەڵبەتە نەك لە ڕێگای لاوەندنەوە و ماچکردنی بەڵکو بە هۆی لێبوردەیی و نەرمی دایك و باوك کە دەبنە فریشتەی



میهرەبانی هەموو ڕێگایەك ئاوەڵا دەکەن و لە هیچ ڕوویەکەوە درێغی ناکەن، دەست و دڵفراوانن، دایك و باوکێکی زۆر باشن توند و تیژی بەکارناهێنن، کەش و هەوای ئاشتی و ئاسایشیان دەوێ، بۆ خێر و خۆشی و ئارامی خێزانیان بۆ هەموو خۆ بەختکردنێك ئامادەن. لە خێزانێکی ئاوادا هەر زوو منداڵ دەبێتە فەرمانڕەوا. پێش پێنەگرتنی دایك و باوك گۆڕەپانێکی پان و بەرینی بۆ هەواو ئارەزووەکانی منداڵ دەرەخسێنن. جارجارە دایك و باوك دەیانەوێ ڕێگەنەدەن، کەچی دەبینن ئیتر درەنگ بووە و ئەزموونێکی زیانبەخشیان وەدیهێنانەوە.

**٨- بە هۆی ئاشنایەتی**

وا دێتە پێش هێشتا منداڵ لە دایك و باوك نەبووە دایك و باوك بەڵێن دەدەن لەگەڵ منداڵەکەیان وەك دۆست و برادەربن. دیارە ئەمە کارێکی باشە، کوڕ و باوك کچ و دایك دەتوانن دۆست بن. پێویستە ئاشنای یەکدی بن. وەلێ لە هەمانکاتدا دایك و باوك ئەندامی سەروەری خێزانن و منداڵان ئەندامانی ژێر بواری پەروەردەکردنن. ئەگەر ئەو دۆستایەتییە سنووری خۆی بەزاند پرۆسەی پەروەردەکردن لەنگ دەبێت یا ئاراستەی پێچەوانەوە خۆدەگرێ. واتە منداڵان دەستدەکەن بە ئامۆژگاری دایك و باوك. ئەم جۆرە خێزانە پتر لەناو ڕۆشنبیراندا هەن. لەم خێزانانەدا منداڵان دایك و باوکیان بە ناوی خۆیان بانگ دەکەن تام لە دیانەیان دەکەن، بە توندی وتەکانیان پێدەبڕن، لەهەر هەنگاوێکدا ڕەهەندی فێرکردنیان لێدادەبڕن. ئیتر باسی گوێڕایەڵی ملکەچی لە نیودەچێ. بەڵام لە ڕاستیدا دۆستایەتییەکی تەواو بوونی نییە چونکە هیچ جۆرە دۆستایەتێك بێ ڕێزی بەرامبەر کامڵنابێ.

### ٩- بە هۆی کڕینی خەڵات و دیاری

ئەمە خراپترین شێوەی وەدەستهێنانی دەسەڵاتە کە بتەوێ بە هۆی بەڵێنی دیاری و خەڵات گوێرایەڵی منداڵ بکڕیت. دایك و باوك بەبێ ئەوەی شەرمەزانن بە منداڵەکەیان دەڵێن ئەگەر گوێرایەڵ بیٚ کەل و پەلی گەمانت بۆ دەکڕین. دەتبەینە گەشت و گوزرار.

دەکرێ لە ماڵێدا هاندان و دڵگەرمکردن هەبێ وەك پاداشت. وەلیٚ ناشیٚ گوێرایەڵی و پەیوەندی باش لەگەڵ دایك و باوك بە پاداشت و پارە بکڕدرێت. لە پای دەرز خوێندن و ئەنجامدانی کاری سەخت و باش دەکرێ پاداشتێکی دیاریکراو لەبەرچاو بگیرێ بەڵام نابێ پێشوەخت پێی رابگەیەنرێ. بابەبەڵێن و بەڵێنکاری منداڵ ناچاری خوێندن و کارکردن نەکرێت.

تا ئێرە چەند جۆرە دەسەڵاتی ساختەمان بەسەر منداڵدا تاوتوێ کرد جگە لەوە جۆرگەلێکی تریش هەنە، وەلیٚ زۆر جار دەبینرێ هنێدێك دایك و باوك لە بیری هیچ جۆرە دەسەڵات و توانایەکی ناو خێزان دانین، هەر چۆنێك بێتە پێش ئاوا دەژین. چۆنیان بە دەستەوە بێ ئاوا منداڵەکەیان پەروەردەکەن. بۆ نموونە ئەمڕۆ لەسەر شتێکی بچووك و بێکەڵك دەیکەنە هەراو منداڵەکەیان تەمبێ دەکەن، سبەینێ خۆشەویستی لە ئاست دەردەبڕین و دووسبەی بەڵێنی پێدەدەن و دیاری بۆ دەکڕن دواتر دەسدەکەنەوە بە تێهەڵدانی، نازانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکەن وەك سوتاو پەنا بۆ ئەم لاو ئەو لا دەبەن، لە نەزانیدا نازانن چیبکەن.

شێوازی دیکەش هەن ئەویش ئەوەیە، باوك جۆرێك رادەسێ و دایك جۆرێکی تر، لە کاتی ئاوادا منداڵ ناچارە پتر لە هەمووان ببێتە سیاسەتوان و فێرببێ چۆن لەگەڵیان بجولێتەوە.



جگە لەوە حاڵەتێکی دیکەش هەیە ئەویش ئەوەیە دایك و باوك گوێ نادەنە منداڵەکەیان تەنیا لە بیری ئاسایش و خۆشگوزەرانی خۆیان دان. کەواتە دەسەڵاتی دایك و باوك لەناو خێزاندا دەبێ چۆن بێت؟

بنەمای دەسەڵاتی دایك و باوك، ژیان کار، سیمای مرۆڤدۆستانە و رەفتاریانە. بەڕێوەبردنی خێزان بەرپرسیەکی قوورس و گرانە ئەوان. لە ئاستی بەختەوەرکردنی خۆیان و ماڵ و منداڵیان بەرپرسن. ئەگەر ئەم ئەرکە مەزنە، جوامێر و شەریفانە بە ئەنجام بگەیەنن ئامانجی بەرز و جوانی بۆ لەبەرچاوبگرن خۆیان بە بەرپرسی کار و کردەوەکانیان بزانن ئەوا خاوەنی دەسەڵاتی راستەقینەی دایك و باوکایەتین.

کە منداڵ فامدەکاتەو دەیەوێ بزانێ دایك و باوکی لە کوێ کاردەکەن و پێگەی کۆمەڵایەتیان چییە. تائەو جێگایەی بکرێت زووتر بزانێ باشترە، پێویستە کار و پیشەی باوك شایستە و جیدیانە بخرێتە بەرچاوی.

لە روانگەی منداڵەوە نرخی دایك و باوك لە لێهاتوویی پێگەیان لەناو کۆمەڵگادا مەزندە دەکرێ نە بە رووکار. گرنیگە لە بواری ئەو ئامانجانەی کۆمەڵگا هەنگاویان بۆ دەنێ منداڵ ئەو لێهاتووییە ببینێ. دەبێ غرووری چاکی کۆمەڵایەتی لە دەروونی منداڵدا چڕۆ بکات، نەك خۆپەرستی و لەخۆبایی بوون، بلیمەت و هەڵکەوتوانی وڵات بناسێ دایك و باوکی وەك ئەوان وێنابکا لەمەڕ هاوکاری و گورج و گۆڵی، لە هەمانکاتدا لە بیرمان نەچێ هەر چالاکییەکی مرۆیی شایستەی و هەوڵ و تەقەلای تایبەت بە خۆی هەیە. هەرگیز نابێ دایك و باوك لە ئیش و کاریاندا وەك بلیمەت و پسپۆری بێ وێنە خۆیان لەقەڵەمبدەن. منداڵان پێویستە لێهاتوویی خەڵکی بە تایبەتی دۆست و ئاشنایانی دایك و باوکیان ببینن. دەسەڵات ئەو کاتە دەگاتە چلە پۆپەی خۆی کە بەرزە فڕ و خۆپەرستانە نەبێت. بەڵکو لە شێوە ئەندامێکی کۆمەڵ دابێت. ئەگەر توانیت منداڵەکەت

واپەروەردەبکەیت شانازی بکات بە شوێنی کار، ئەو کارگە، یا ئەو دامەزراوەی کاری تێدادەکەیت و بە سەرکەوتنەکانی شادمان بێت ئەوا منداڵەکەت باش پەروەردەکردووە. دایك و باوك نابێ وەك توخمێك لە بۆتە چکۆڵە و کۆمەڵایەتییەکەی خۆیاندا بمێننەوە. ژیان ژیانی کۆمەڵایەتییە. دەبێ وەك هاوکار وەك هاوبەشی ژیان لەگەڵ منداڵەکەیان بن، ڕووداوەکانی ژیانی نێودەوڵەتی ئەدەب و زانستەکان لە بیر و هەست و هەوڵەکانیاندا رەنگ بداتەوە. تەنیا ئەم دایك و باوکانە لە بواری کاملی ژیان دان و دەسەڵاتی واقیعیان بەسەر منداڵەکەیاندا هەیە، بۆ ئەوەی لە ژێر کارلێکی ئاکارەکانتان بن و بیبینن نابێ ئەم رەهەنەندە ساختە یا رووکار بێت، چونکە بنچینەکە عەیبدار دەبێت. پێویستە چۆن هەن ئاوا راست و رەوان بژین و هەوڵ مەدەن لەبەرچاوی منداڵەکانتان خۆتان بنوێنن، دڵنیابن ئەو شتەی پێویستە ئەوان دەیبینن.

ئێوە تەنیا ئەندامێکی کۆمەڵ نین، باوکیشن، تائەو شوێنەی دەکرێ ئەرکەکانی سەرپەرشتی کردن چاکتر ئەنجام بدەن، رەگ و ریشەی باوکایەتیان لێرەوە سەرچاوەدەگرێ. پێش هەموو شتێك پێویستە بزانن ژیانی منداڵان چۆنە، چییان پێخۆشە لە چی بێزارن، چییان دەوێ و چییان ناوێ، منداڵەکەت لەگەڵ کێ و بە چ شێوەیەك گەمان دەکات. ئەو شتەی نایەوێ چۆن دەرکی دەکات، لە خوێندنی قوتابخانەی ئاگاداربی و بزانی تاکوێ حەزی لە خوێندنە، هەستی خۆشەویستی لە ئاست مامۆستایەکانیدا چۆنە گیر و گرفتی وانەکانی چییە. لەگەڵ قوتابییەکانی پۆلەکەی چۆن دەجولێتەوە. پێویستە هەموو ئەوانە لە سەرتاوە بزانن، نابێ دوای رووداني کارەساتی دڵتەزین و چاوەڕوان نەکراو وەئاگابێن. بەڵکو پیویستە پێشبینی بکرێت و رێگەی لێبگیرێ. بەو مانایەش نا بۆ ئەو مەبەستە بە پرس و جۆو لێکۆڵینەوە و وەدوورکەوتنی و زمان لوسی منداڵەکەتان بێزاربکەن، هەر لە دەسپێکەوە بنەمای دارشتن وابێ منداڵەکان خۆیان لەمەڕ کارەکانیان لەگەڵتان بدوێن و گفتوگۆیان لەسەر بکەن، رابێن راو رێنونێنیتان لەبەرچاوبگرن.

هێندێك جار پێویستە دۆسی منداڵەکەتان داوەت بکەن، میوانتان بن بێ سوود نییە ئەگەر لەگەڵ خۆیان و خانەوەدەیان ئاشنابن. ئەم گوێپێدان و زانیاریانە سەرنجی منداڵ رادەکێشن و لەو پێناوەدا رێز لە دایك و باوکیان دەگرن. ئەم زانیاری و ئاگاداریانە دەسەڵات لە رێگەی یارمەتی و هاوکارییەوە دەخولقێنن. هەڵوێستگەلێك بۆ منداڵ پێش دێ نازانێ چۆن هەڵسوکەتی لەگەڵ بکاو کەی و لە چ کاتێك پێویستی بە یارمەتی و رێنوێنی دەبێت، رەنگە ببەوێ داوای یارمەتیتان لێبکات بەڵام نازانێ کەی لە کوێ، لەبەر ئەوە پێویستە تۆ خۆت بە هانایەوە بچێت. واهەیە ئەم یارمەتیدانە بە رێنشاندانێکی راستەوخۆ یا بە گاڵتە و گەپ یا بە فەرمانێك یا رەنگە بە کەمێك توند و تیژی بێت. ئەگەر باش شارەزای ژیان و توانای منداڵەکەتان بن دەزانن باشترین رێگەی یارمەتیدان هەڵبژێرن. پێش دێ، دەبێ هاودەمی یاری منداڵەکەتان بن و دۆستەکانی بناسن، یابچیتە قوتابخانە لەگەڵ مامۆستاکانی بدوێن ئەگەر خیزانەکە فرە منداڵ بێ ئەمە لایەنێکی باشی تێدایە دەشێ داوای یارمەتی لە خوشك و براکانی بکرێت.

پشتیوانی دایك و باوك نابێ منداڵ وەرەز و ماندوو بکات لە بوارگەلێکدا پێویستە ئەو گیرو گرفتەی دێتە پێشی بخرێتە ئەستۆی منداڵ. تاڕابێت بەسەر لەمپەرەکاندا زاڵ بێت بەڵام دەبێ هەمیشە ئاگاداربن چۆن ئەو کارە ئەنجام دەدات. رێگە نەدرێت لە کارەکەیدا سەری لێبشوێ و بێ هیوابێت. جاری وایە پێویستە منداڵ هەست بکات متمانەت پێیەتی. وریای و سەرنجی هێز و توانای دەدەی. هاوکاری ویرای ئاگایی و رێنوێنی راست تەواوکەری زانیارین لەمەڕ بە هێزکردنی دەسەڵات. بوونت لە تەکیا و خەمخۆری ژیرانەت هەست پێدەکا، هەمیشە هەستیارە و دەزانێ چیت

لێی گەڕەکە و ناتەوێ گشت کارەکانی بۆ ئەنجام بدەی تا ئەو هەست بە لێپرسینەوە بکات، ئەمە یەکێکە لە شێوازەکانی دەسەڵاتداربوونی دایك و باوك.

هەرگیز نابێ منداڵ و واتێبگا لە پێناوی خۆشی خۆتان سەرپەرشتی ماڵەوە دەکەن، بەڵکو دەبێ بزانێ لە پێناوی خۆت و ئەویش لە بەرامبەر کۆمەڵگا بەرپرسیاری.

لەوە مەترسن بە کوڕەکەتان یا بە کچەکەتان بڵێن تۆ دەبێ پەروەردەبکرێت و پێبگەیت، زۆر شت ماوە فێری ببی، هەندێك جاریش بە توندی باسیبکەن و ڕێگەی بەرهەڵستکردنیش مەدەن. دەبێ بڵێم ئەم ویستانە تەنیا کاتێك بە کەڵکن کە پێشتر دەسەڵات و بەرپرسی خۆتت لە مێشکی منداڵەکەتدا چەسپاندبێ. هەر لە سەرەتای تەمەنیەوە منداڵەکەت دەبێ بزانی ژیان چۆڵەودانی نییە و لەگەڵ دایك و باوکی لە چۆڵگەدا ناژی.

بۆ پۆڵێنکردن باسەکەمان کورت دەکەینەوە و کۆتایی بەم بەشە دێنین.

دەسەڵات لەناو خێزاندا فاکتەرێکی پێویستە

پێویستە دەسەڵاتی ڕاستەقینە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە ساختەیە جوێبگرێتەوە کە دامەزراوە لەسەر بناغەی هەڵە و هەوڵی دابینکردنی گوێڕایەڵی منداڵ بە هەر شێوەیەك. دەسەڵاتی ڕاستەقینە لەسەر چالاکی کۆمەڵایەتی و هەست و نەریت، لەسەر زانیاری ژیان، یارمەتی و هاوکاری لەسەر ئەو بەرپرسییە دادەمەزرێت کە لە پێناوی منداڵەکەتدا وەئەستۆت گرتووە.



# دیسپلین

دیسپلین چییە؟ هێندێك دیسپلین بە دەستوورگەلێکی ڕەفتاری و مرۆیی دادەنێن، هێندێکی دی لایان وایە خووخدەی پەروەردەکردنە، بەشی سێهەم لە گوێڕایەڵی و ملکەچیدا دەیبیننەوە. ئەم بۆچوونانە بە تەنیا هەریەکەیان کەم تاکورتێك لەو ڕاستیە نزیکن، بەڵام بۆ پەروەرکار وێناکردنی وردتر لەمەڕ ڕەهەندی دیسپلین پێویستە. جاری واهەیە دیسپلین بەو کەسە کەسە دەڵێن کە زۆر گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارە. دیارە لە زۆر ڕووەوە هەر کەس بەپێی توانی خۆی دەبێ دیدگەی ئەوانی تر پەسندبکا. لە هەمانکاتدا، لە جیهانی ئەمڕۆدا دەستەواژەی گوێڕایەڵی نابێتە دیسپلین و فەرمانبەرداری. ئەو مەبەستە بە تەواوەتی ناگەیەنێ. گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری کوێرانە لە قوتابخانە کۆنەکانی پەروەردەکرندا ڕەواجیان هەبووە وەلێ ئێمە ناتوانین کەڵکیان لێوەربگرین.

ئێمە دیسپلینی قووڵتر و کامڵترمان لە مرۆڤی ئەمڕۆ گەرەکە. دەمانەوێ نەك هەر تێبگا و بزانێ بۆچی و لەبەرچی کاربکا، بەڵکو بە ویست و ئارەزووەوە چالاکانە تائەو سنوورەی دەلوێ چێتر بە کارەکەی هەستێت و بەئەرکی سەرشانی خۆی بزانێ، چاوەڕوانی دەستور و فەرمان نەبێت، بە وردی و ویستی داهێنەرانەوە لە هەردەم و ساتێکدا ئامادەی ئەنجامدانی کاری پێ سپێردراوی خۆی بێت. ئارەزوومانە بەو کارە هەستێت کە لە ڕاستیدا بۆ کۆمەڵگا بە کەڵك و پێویستە، هیچ گرفت و بەربەستێك نەتوانێ بیوەستێنی، بە پێچەوانەوە لە مرۆڤی ڕاستەقینەمان دەوێ خوببوێری لەو کردارانەی تەنیا ویست ئارەزووی خۆی بە جێدێنی و زیان دەگەیەنێ بە خەڵك و سەرتا خواری کۆمەڵگا. لەگەڵ ئەوەشدا لە خولگەی، پیشە، کارگە، کاری خێزانیدا نەمێنێتەوە، شارەزای کارو پیشە، ژیان و

ڕەفتاری خەڵکانی دەوربەری بێت. نەك بەووتە بەڵکو بەکردەوەش بە هانایانەوە بچێت، ئەگەر پێویستی کرد بەشێك لە ئاسایشی خۆی بکاتە قوربانی.

بە کورتی بەو مرۆڤە دەوترێت خاوەن دیسپلین هەمیشە و لە هەموو هەل و مەرجێکدا بە کەڵکترین شیاوترین ڕەفتار هەڵبژێری، ئەوەندە خوراگربێ وێڕای هەر گرفت و دژواریەك بتوانی تاکۆتایی درێژە بە کارەکەی بدات. پێویستە دایکان و باوکان بزانن دیسپلین بەر ڕێبازی سەرباگەرایانە وەدینایەت. بەڵکو بەشێوازی پەروەردەیی و کارلێکی چوارچێوەی ژیان لەسەر منداڵ بە ئەنجام دەگات. ئەگەر دیسپلین ئاوا وێنابکەین دەگەینە ئەو بڕوایەی کە ڕێ و ڕەسمی پەروەردەکرن نییە بەڵکو دەرئەنجامیەتی. کەواتە ئەگەر دایك و باوك کاتێك کتێبك بۆ خوێندنەوە دەدەنە منداڵەکەیان، یا منداڵەکەیان دۆستێکی نوێ دەناسێنن، یا لە بوارگەلێکی جیاواز لەگەڵی دەدوێن ئەوا لەسەر ڕێچکەی دیسپلین هەنگاو هەڵدێنن. وەلێ تاڵێکی بارێك لە پەروەردەکردندا هەیە کە پتر لە هەموو شتێك لە دیسپلین نزیکە ئەویش شێوازی پەروەردەکردنە کە زۆر جار لەگەڵ خودی دیسپلین تێکەڵ دەبێت.

ئەگەر دیسپلین دەرئەنجامی شێوازی پەروەردەکردن بێ کەواتە شێواز تەنیا ئامرازی پەروەردەکردنە، جیاوازی نێوان دیسپلین و شێواز گەڵێك گرنیگە، پێویستە پەروەرکاران سەرنجی بدەنێ. دیسپلین لە ریزی دیاردەگەلێکە کە هەمیشە خوازیاری باشترین شێوەیین، لە خانەوادەدا لە ئیش و کاردا باشترین و تۆکمەترین دیسپلین گەرەکە، لەمەش بەولاوە نابێ ببێ، چونکە دیسپلین مانای ئەنجام، ئێمەش واراهاتووین لەهەر کاتێکدا لە پێناوی باشترین ئەنجام خۆمان ماندوو دەکەین.

شێواز شتێکی دیکەیە وەکو گوتمان تەنیا ئامرازی کارە، تەنیا ئەو کاتە دەخرێتە گەڕ کە لەگەڵ ئامانجەکە یەك بێت و یەکبگرێتەوە. دەبێ ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ کە لە بوارێکدا شێوازێکی دیارکراو دەگونجێت لە بوارێکی تردا شێوازێکی تر.



شێوازی پەروەردەکردنی خێزانی نابێ و ناکرێ لە هەموو هەل و مەرجێکدا یەکسان بێت، تەمەنی منداڵ، ڕادەی زیرەکی، دەروبەر و دراوسێ، گەورە و بچووکی خانووی نیشتەجێ، هاتووچۆی ناو شەقامەکان، گەلێك هەل و مەرجی تر تایبەتمەندیەکانی شێواز دەگۆڕن.

خێزانێکی بەربلاوی فرە منداڵ شێوازی پەروەردەکردنی دیاریکراوی هەیە، بۆ ئەو خێزانەی تەنیا منداڵێکی تێدایە دەبێ شێوازێکی دیی لە ئاردا بێت، ئەو شێوازەی بۆ منداڵێکی کەم تەمەن دەگونجێ ڕەنگە بۆ منداڵانی بە تەمەنتر زیانبەخش بێت، بەم پێیە لە ژێر ناونیشانی شێواز ناتوانین چەمکێکی هەمیشە و نەگۆڕ لەبەرچاوبگرین کە هێندێك خێزان هەڵەی تێدادەکەن. کاتێك شێوازێك هەڵدەبژێرن وەك ڕەهەندێکی پیرۆز و نەگۆڕ وەریدەگرن و لە هەموو هەل و مەرجێکدا بەکاردێنن، ئەم شێوازە ڕەق و ڕووتە وەك ئامرازێکی مردوویی لێدێت نەك هەر بێسوود دەبێ بەڵکو زیانیشی لێدەکەوێتەوە.

شێواز بەپێی تایبەتمەندییەکانی خۆی ناتوانێ هەمیشەیی بێت، بە تایبەتی کە تەنیا ئامرازێکە بۆ پەروەردکردن، هەر کردە بەکی پەروەردەیی ئامانجێکی بەدواوەیە. ئەو ئامانجانەش ئاڵوگۆڕیان بەسەر دادێت، ئاڵوزتر دەبن لەبەر ئەوە پێویست بە شێوازی دی دەکات. بۆ نموونە لە سەرتاکانی منداڵیدا ئەرکێکی زۆر گرنگ و جیدی هەیە کە بریتییە لە ڕاهێنانی منداڵ لەسەر پاك و خاوێنی، بۆ ئەم مەبەستەش دایك و باوك ڕێوشوێنی تایبەتی بۆ منداڵ دیاری دەکەن، واتە ڕێورەسمی شستوشۆ، کەڵك وەرگرتن لەوان، دوش، خۆشتن، ماڵین و گەسك دان، ڕێورەسمی خاوێن کردنەوەی دیوی خەوتن، مێزی نانخواردن لە هەمانکاتدا چاودێری ئەنجام دانیشی دەکەن، سەرئەنجام منداڵ خوو بە پاك و خاوێنیەوە دەگرێت. کاتێك نەیتوانی بە دەستی پیس لە پشت مێزی نانخواردن دابنیشێ ئەوسا دەتوانین بڵێین مەبەستمان پێکاوە، کەواتە ئەو شێوازەی بۆ ئەو ئامانجە پێویست بوو ئێستا بێ

هوودەیە، ئەمەش بەو مانایە نییە دەکرێ ئەم شێوازە لە شەو و ڕۆژێکدا بگۆڕێت، بەڵکو پێویستە وردە وردە شێوازێکی دیکە جێگەی بگرێتەوە. دیارە ئەوەش بەمەبەستی سەقامگیرکردنی ئاکاری پێشوویە. کە ئەم ئامانجەش جێگای خۆی گرت ئانجگەلی نوێی ئاڵۆزتر و گرینگتر دێتە پێش لە کاتی ئاوادا درێژەدان بە شێوازی پارێزگاری خاوێنی نەك هەر هێزی پەروەرکار بە فیرۆ دەدات بەڵکو کەسایەتییەکی خاوێن و دەست و پێ سپی باردێنێ کە جگە لە خووخدەی پاك و خاوێنی هیچ شتێکی دیکەی لە باردانابێ، ئەم جۆرە کەسایەتییەش تەنیا بەکاری ئەوە دێ کارێك ئەنجامبدا دەست و پێی پیس نەبێت.

لەم نموونەیەدا دەبینین پاك و خاوێنی شێوازێك یا دیاردەیەکی کاتی و زووتێپەرە. هەر ئامرازی  کارکردنیش هەروایە. شێوازیش تەنیا ئامرازێکە ناکرێ دایك و باوك باوکان بە تەنیا شێوازێکی دیاریکراودا ئاراستەبکرێن. شێوازەکان لە ئەژمارنایەن، دەبێ کامیان لەباتر و لۆکالێکی دیاری کراوی هەیە ئەویان هەڵبژێرێن.

لەگەڵ تێکرای جۆرگەلی شیاوی ئەم شێوازانە دەبێ شێوازی پەروەردەکردن لەناو خێزاندا هەمیشە خەسڵەتە دیاریکراوەکانی خۆی هەبێت و لەهەر هەل و مەرجێکدا تایبەتمەندی خۆی بپارێزێت.

خەسڵەتە گشتییەکان پتر شێوازی پەروەردەکردن دەخەنە بەرباس و لێکۆڵینەوە. یەکەم خاڵ کە پێویستە سەرنجی ئیوەی دایك و باوك رابکێشێ ئەوەیە: هەڵبژاردنی هەر شێوازێك پێویستە ئامانجێکی بەدواوە بێت. نابێ ئەو یاسا و ڕێسایە بۆ ژیان لەناو خێزاندا بخرێتەگەڕ تەنیا لەبەر ئەوەی خانەوادەیەکی دی کەڵکی لێوەرگرتووە. یەکەمجار پێویستە خۆت ئەو ئامانجە بزانێت و شارەزایی ببیت. زۆرجار پێویستە منداڵیش بە تەواوەتی لەگەڵی ئاشنابێت. بۆ نموونە ئەگەر لە منداڵەکەت ویست لەکاتی دیاریکراو لەسەر خوانی نانخواردن ئامادەبێت وێڕای ئەندامەکانی تری



خێزان لە پێش مێزی نانخواردن دابنیشێ، دەبێ منداڵ تێبگا ئەم کارە پێویستە لە لایەن کاری دایك یا کابانی ماڵ ئاسان دەکا لە لایەکی تر گشت ئەندامانی خێزان، شەو و ڕۆژ چەند جار لە دەوری یەك کۆدەبنەوە بیر و بۆ چوون هەست و نەستیان لەگەڵ یەك باس دەکەن. ئەگەر لە منداڵەکەت ویست خواردنەکەی بە نیوەچڵی بەجێنەهێڵێ دەبێ بزانێ ئەوە لەبەر ڕێزدانان بۆ ئەو کار و کۆششەی ئادامیزاد کە بەروبوومی خواردمەنی بەرهەمدێنێ، ئەوە ڕێزلێنانی ڕەنج و زەحمەتی دایك و باوکە، پاشەکەوت و بە فیڕۆنەدان کارێکی پێویستە.

پێمان شکدێ دایك و باوك داواکارن منداڵەکانیان لە کاتی نانخواردن بێدەنگ بن، ئەوانش بەپێی ویستی ئەوان ئەم کارەدەکەن کەچی نە ئەمان نە ئەوان نازانن ئەم فەرمان و بڕیارە پێویستییەکەی لەچییدایە، کاتێك بەڵگەکەیان لە باوك دەوێت دەڵێن ئەگەر لە کاتی نانخواردندا بدوێن دەخنکێن. بەڵام ئەوە نەزمێکی ژیرانە نییە، خەڵکی بەگشتی حەزدەکەن لە کاتی نان خواردن لەگەڵ یەکدی بدوێن و هیچ ڕووداوێکی دڵتەزێنیش ڕوونادات.

لە هەمانکاتدا داوامان ئەوەیە ڕێورەسمی خانەوادە ژیرانە و خاوەن ئامانج بێت. بەڵام خۆبپارێزن لەوەی لەهەر هەنگاوێکدا ئەم یا ئەو ریسایە ڕوون بکەنەوە، تا ئەو شوێنەی دەکرێت با هەوڵبدەن منداڵان خۆیان تێبگەن بۆ ئەم یاسایە پێویستە. تەنیا لە کاتی ناچاری پێیان بڵێن کام ڕێگایە ڕاستە. بە گشتی دەبێ هەوڵ بدرێ تا ئەو سنوورەی دەشێ خووی باش و بەردەوام و سەقامگیربکرێ، بۆ ئەم مەبەستەش مەشقکردنی ڕەفتاری ڕاست گەلێك گرینگە.

یەکێکی تر لە خەسڵەتە پڕ بایەخەکانی هەر شێوازێك ڕوون و ئاشکرا بوونییەتی. خۆ ئەگەر ئەمڕۆ ددان شتن پێویست بێ، سبەینێش هەر پێویستە. ئەگەر ئەمڕۆ دوای لە خەوهەستان قەدکردنی پێخەڤ پێویستبێ، سبەینێش هەر پێویستە. ئەگەر

ئەمڕۆ لە منداڵمان ویست بێخەفەکەی قەدکات و هەڵیگرێتەوە، چاوەڕوان بین هەر سبەینێ ئەم کارە ئەنجامداتەوە، بارودۆخی ئاوا مانا و رەهەندی ئەو شێوازە لە نێودەبا. ئەوسا دەبێتە فەرمانگەلێکی سەرپێی کە هیچ پەیوەندیەکیان بە یەکدییەوە نییە. نەزمی راست و دروست دەبێ بە مەشق کردن و وردەکاری لە ئەنجامدانیدا بناسرێ. مەگەر ناچاری بێ دەنا نابێ هیچ جۆرە هەڵبواردنێکی تێدایی. لەسەر ئەم بنەمایە لە نێو خێزاندا دەبێ نەزمێکی ئەو تۆ بخرێتەگەر کە بچووکترین هەڵەی پێوەدیاربێ. ئەم پرۆسەیە هەر لە سەرەتایی منداڵیەوە دەبێ لەبەرچاو بگیرێ. دایك و باوك چەند لەسەر ئەنجامدانی ئەم شێوازە توندبن و پتر چاودێربن بەو ئەندازەیە کەم و کوڕی کەمتردەبێ، کەمتریش دێتە پێش پەناببەنە بەر توند و تیژی.

کاتێك منداڵەکە لە خەوهەڵدەستێ و پێخەڤەکەی کۆناکاتەوە دایك و باوك دەکەونە دوودڵییەوە، منداڵەکەیان تەمبێ بکەن یا باشتروایە بۆ شتێکی وابچووك مێشکی تێکنەدەن. وەلێ پێویستە بزانین لە پرۆسەی پەروەردەکردندا بابەتی بچووك بوونی نییە. کۆنەکرانەوەی بخێەڤ نەك هەر کەمتەرخەمییە بەڵکو گوێنەدانە بەو شێوازەی لە ئارادایە. ئەمە خۆی بنچینەی سەرهەڵدانی سەرپێچییە. سنووری شێواز، وردەکاری و پێویستی ئەنجامدانی، ئەو کاتە دەکەوێتە مەترسییەوە کە ئەگەر خود دایك و باوك لەمەڕ ئەم شێوازە راست و راستگۆ نەبن. ئەگەر داوا لە منداڵ بکرێ پەیڕەوی نەزم بکات لە هەمانکاتدا خودی دایك و باب گوێ نەدەنە ئەو نەزمە ئاساییە کە منداڵەکەش عادەتی پێوەناگرێ، ئەگەر لە منداڵەکەت ویست لە کاتی نانخواردن یا بەڕاکشانەوە کە بۆ چاو زیانبەخشە، کتێب نەخوێنیتەوە نابێ خۆشت ئەو کاربکەیت.



کاتێك سووری لەسەر ئەوەی پێش نانخواردن دەست و پلی بشوات، لە بیرت نەچێ دەبێ تۆش هەمیشە ئەو کارە بکەیت، لە تێکڕای ئەم کارانەدا تێگەیشتن زۆر لەو گرینگترە کە بە بیرت دادێ.

شێواز لەم بابەتانەی خوارەوە دەبێ ناسراو و دیاریکراو بێت:

کاتی خەوتن و لە خەوهەستان بە وردی دیاری بکرێت، بە وردی یاسا و رێسای پاك و خاوێنی لەبەرچاو بگیرێ، سەروەختی جل و بەرگ گۆڕین و لەبەرکردن دیاری بکرێت. منداڵ دەبێ خوو بگرێ کە شتێك جێگای تایبەتی خۆی هەیە دوای کارپێکردن و یاری پێکردنی لە شوێنی خۆی دابنرێتەوە. هەر لە سەرتاوە دەبێ بزانی چۆن خۆی دەشواو دەچێتە سەرئاو. شارەزایی هەڵکردن و کوژاندنەوەی لامپەکانی ماڵەوەبێ، نەزمێکی تایبەت بۆ سەمێزی نانخواردن هەبێ هەر منداڵە جێگای خۆی بزانێت لە کاتی خۆیدا ئامادەبێت، شارەزایی هەڵسوکەوتی نانخواردن و بەکارهێنانی کەوچك و چنگاڵ بێت. خواردن لەسەر مێز نەرێژێ، ئەوەندی بۆی تێکراوە بیخوات و پتر لە خواردنی خۆی داوانەکات.

پێویستە نەزمێکی راست بۆ دابەشکردنی کاتژمێرەکانی ئیشی منداڵ لەبەرچاو بگیرێ بە تایبەتی ئەو دەمەی دەچێتە قوتابخانە. وەلێ پێش چوونە قوتابخانەی سەرەتایی باشتر وایە کات و ساتی نان خواردن و گەمەکردنی دیاربێت. رامان لە جموجۆڵی گەلێك پێویستە. هێندێك لایان وایە منداڵ دەبێ زۆر عارەدات و هات و هاواری بێ، بۆ نواندنی وزە و ئینوژی خۆی لە هەڵسوکەوت دابێ. گومان لەوەدانییە پتر لە گەورەکان فیازندنی جموجۆڵە. بەڵام نابێ کوێرانە وەدووی ئەم پێویستی و نیازمەندییە بکەوین، بە گشتی پێویستە منداڵ پەی بە کەڵك و خۆی جموجۆڵ ببات تا بتوانێ هەر کاتێك پێویست بوو پێشی پێبگرێ.

نابێ هەرگیز رێگەبدرێت منداڵ لە کونی ژووریدا غاردات تەراتینی تێیدا بکات، بۆ ئەمەش حەسار و ناو باخ و لە بارە، بەم پێیە دەبێ فێربکرێ هات و هاوار ئەوانی تر ئازا دەدات، قاو و تیژ و نەسرەوتنی منداڵ دیاردەیەکە یارەنگە کەم تاکورت لە ناتەواوی مێشکی منداڵەکە وەبێ یا پێویستییەکی واقیعی لەش و لاریەتی زۆر، جار خودی دایك و باوك هۆکاری هات و هاوار و تورەیی منداڵن. چونکە گەلێك جار تا سنووری هاوار دەنگیان بەرزدەکەنەوە یا تورەدەبن لە کاتێکدا دەبێ ئەوان کەش و هەوای ئارامی ناو ماڵ رابگرن.

لە لایەکی ترەوە منداڵ بەشێکی کاتی خۆی لەگەڵ هاوەڵەکانی بەسەردەبات جا چ لەناو حەساری ماڵی یا لە دەرەوە یا لەسەر جادە و کۆڵان و یاری و یاریگاکان، تا منداڵەکە گەورەتر بێت. پەیوەندی لەگەڵ دۆستەکان رۆڵێکی گەورەتر دەبینێت، دیارە ناکرێ دایك و باوك رابەری ئەم دۆستایەتییە و یارییەکانی منداڵ بن. وەلێ دەتوانن بە تەواوی چاودێری کارلێکی دۆستەکانی بن، ئەمەش کاتێك مەیسەر دەبێ کە لە ماڵیدا ویستی هاوبەشی کۆمەڵایەتی هەبێت، راستگۆیی و پشت پێبەستن لە ئارادابێ و دەسەڵاتی دایك و باوك بەراست و دروستی جێگر بووبێ. لەم هەڵ و مەرجانەدا دەبی بە پرس و جۆ بزانین کچەکەیان یا کورەکەیان کێیان بە دەورەوەیە، ئەگەر لەگەڵ دۆست یا دایکی و باوکی دۆستەکانیان ئاشنابن، لە نزیکەوە لە یارییەکانیان بزانن یا بەشداریان بکەن، لە گەڵیان بچنە گەڕان و سینەما تووشی ئاکاری خراپ و بە تایبەتی کەمتەرخەمی و بەرەڵایی نابن، ئەم نزیککەوتنەوەیە لە ژیانی منداڵ هەرگیز کارێکی دژوار نییە بگرە دەبینە هۆی خۆشحاڵییان، رێگەدەدات لە نزیکەوە پەیوەندی منداڵ و دۆستەکانیان ببینێ. هەستی و نەستی خۆیان لەگەڵ باسبکەن راو بۆچوونی خۆیان لەمەڕ دۆستەکانیان و چاك و خراپی ئاکار و ئیدەکانیان دەربڕن و لە بارەی سوود و زیانی ئەم یائەو گەمەیە بدوێن. بەکەڵك وەرگرتنی لەم رێنوێنییە گشتییانە هەر دایك و باوکێك



دەتوانێ کلێشەی ژیانی خێزانی خۆی بە شێوەیەکی ئەو تۆ بنیاد بنێ کە لەگەڵ تایبەتمەندی خانەوادەکەی یەکبگرێتەوە. پرسی پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵ لە رادەبەدەر بایەخی هەیە. لەم بەشەدا لەم زیادە رۆییانە دەدوێین کە زیان بە پرۆسەی پەروەردەکردن دەگەیەنن. هێندێك زیادە رۆیی لە مانە دەبینینەوە یەکەم خراپ کەڵك وەرگرتن لە بڕیار، دووەم لە روونکردنەوە، سێهەم لە نوێ خوازی، چوارەم دەستور و فەرماندان، پێنجەم هاندان شەشەم تەمبێ کردن حەوتەم لێبوردن و چاوپۆشی تاقمێکیشی هەن لە توند و تیژیدا.

لە پرسەکانی خێزاندا زۆر جار وادێتە پێش کە لاواندنەوە، دواندنی منداڵەکە، توند و تیژی، لێبوردن و چاوپۆشی کارێکی نابەجێن. وەلێ لەو شوێنەدا کە پەیوەندی بە شێوازەوە بێ تێکڕای ئەم کەم و کوڕیانە دەبێ جێگەی یەك فۆرم و یەك شێوە بگرنەوە ئەویش بریتییە لە فەرمان دەرکردنی خانەوادە کە یەکێکە لە کاری هەرە گرنیگ پڕ لە بەرپرسی. نابێ لە بەکارهێنانی شێوەیەکی جدی فەرماندان دایك و باوك بترسن، چونکە شێوەی جیدی لەگەڵ سۆز و هەستی خۆشەویستی ناکۆك نییە. یاوای لێکبدەنەوە دەبێتە هۆی ساردی وشکی پەیوەندی نێوان منداڵ و دایك و باوك.

ئێمە بە تەواوەتی لایەنگری ئەوەین تەنیا یەك شێوەی واقیعی جیدی دەتوانێ کەش و هەوای ئارام بۆ پەروەردەکردنی منداڵ برەخسێنێ و لە هەمانکاتدا بۆ کامڵکردنی رێزنی یەکدی و سۆز و خۆشەویستی نێوان ئەندامانی خێزان پێویستە. تادەکرێ دایك و باوك دەبێ لە سەرخۆ وبە خۆڵقخۆبن هەمیشە یەك قسە و جید بن و منداڵەکەیان خوو بە شێوە گوفتارەوە بگرێت. فەرمانەکانی بە خۆشەویستییەوە فەرمانەکان بە خۆشەویستیەوە ئەنجام بدا و پەیڕەویان بکات، دەتوانن تائەو جێگایەی پێویستە بە سۆزەوە لەگەڵ منداڵ بجولێنەوە گاڵتە و یاری لەگەڵ بکەن. لە کاتی پێویستدا کەم و کورت تەنیا یەکەجار فەرمان بدەن. ئەو فەرمانەش دەبێ

به شێوه و حاڵەتێکی ئەوتۆ وەربگرێ کە نە دایك و باوك نە منداڵ لە ڕاستییەکەیی و لە ڕاشکاوی بە جێهێنانی دوو دڵنەبن. هەر زوو کە هێشتا یەکەمین منداڵ لە ساڵ و نیوێك تێپەڕنەبوو پێویستە ئەم فەرمانانە دەربکرێت. ئەمە کارێکی سەخت نییە، تەنیا دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێت:

١- نابێ بە ڕق و قین و بە هات و هاوار و توڕەییەوە فەرمان دەربکرێت ناشبێ لە پارانەوە بچێت.

٢- ئەنجامدانی فەرمان دەبێ لە توانای منداڵ دابێ، نابێ گوشاری زۆر بخرێتە سەر.

٣- فەرمان دەبێ ژیرانە و لەگەڵ عەقڵی کامڵ ناکۆك نەبێت.

٤- هەر فەرمانە نابێ پێچەوانەی فەرمانەکانی پێشوو بێ.

ئەگەر فەرماندرا دەبێ یەك قسە ئەنجامبدرێ. زۆر جار خراپە ئێستا فەرمانێك بدەی و دوایی فەرامۆشی کەی. کنترۆڵ و لێپرسینەوە دەبێ لە چوارچێوەی ماڵیدا هەبێت و لە منداڵ شاراوە بێت. وەلێ جاری واهەیە کاری گرینگتر و مکتورتر دەخرێتە ئەستۆی منداڵ کە بە جێگەیاندنی بایەخدارە ئەوسا لە جێی خۆیەتی بە ئاشکرا کۆنترۆڵ بکرێت. ئەگەر منداڵ فەرمانەکانی بەجێنەگەیاند دەبێ چی بکەین؟

پێش هەموو شتێك هەوڵبدرێ گرفتێکی ئاوا نەیەتە پێش، بەڵام ئەگەر ڕوویدا و یەکەمجار بوو منداڵەکە گوێی نەدایە پێویستە بەشێوەیەکی جیدی تر دووبارە بکرێتەوە. دەبێ بابەتەکە تاوتوێ بکرێ و بیر لەوە بکرێتەوە بۆ چی یەکەمجار نکۆڵی لە ئەنجامدانی ئەو کارە کراوە. ئەوسا بە دڵنیاییەوە دەبینی تا ئەندازەیەك



خۆمان کەمتەرخەمیتان کردووە یا کارێکتان بە باشی ئەنجامنەداوە یا هێندێك خاڵتان لەبەرچاو نەگرتووە. ئەوسا هەوڵبدەن لەو هەڵانە دووركەونەوە.

لەم بەشەدا ئەو خاڵە گرینگەی دەبێ ئاگاداری بن ئەوەیە ئەم سەرپێچی کردنەی منداڵ نەبێتە دیاردەیەك شێوازی خێزان تێکبدات، چونکە زۆر خراپ و دزێوە. ئەگەر سەرەتا ڕێگەی ئەم کارە نەدرێت لە ئایندە ناچار نابن ببەنەبەر تەمبێ کردن. ئەگەر شێوازی دیسپلین هەر لە سەرەتاوە تۆکم بکرێتەوە و دایك و باوك بە وردی کامڵبوونی لەبەرچاو بکرن تەمبێ کردن هەرگیز پێویست نابێت.

وەلێ خانەوادەی وا هەن لە پرۆسەی پەروەردەکردندا خۆیان گێل کردووە و ناتوانن چاو لە تەمبێ کردن بپۆشن لەم بارودۆخانەدا دایك و باب نا ژیر و ناشیانە دەستدەکەن بە لێدانی منداڵەکەیان لە بری ئەوە کارەکە چاك بکەن خراپتری دەکەن، لێدان زۆر دژوارە، پەروەرکار دەبێ لە ئەنجامدانی ئەم شێوازە خۆبپارێزی لەبەر ئەوە داوا لە دایکان و باوکان دەکەین تا ئەو سنوورەی دەکرێ خۆیان لە لێدانی منداڵ بپارێزن پێش هەموو شتێك هەوڵبدەن ڕێگایەکی ڕاست و بەجێ بدۆزنەوە. دیارە ئەمەش کاتێکی زۆر و پشووی درێژی دەوێ وەلێ دەبێ بە لە سەرەخۆیی چاوەڕوانی دەرئەنجامەکەی بکەن. تەنیا لە هێندێك حاڵەتی ناچاری ڕێگەی هێندێك جۆر تەمبێ کردن هەیە وەك ڕێگرتن لە گەڕان یا ئەگەر بڕیار چوونە سینەما هەبوو داوبخرێ یا پارەی ڕۆژانەی نەدرێتێ ئەویش ئەگەر فێرکرابوو هەروەها ڕێگرتن لە چوونە لای دۆست و هاوڵەکانی بەگشتی لە ژیاندا لە هەموو شتێك گرینگتر و بە کەڵك تر ئەوەیە ئاکاری باش لە دایك بێت نەك چاککردنەوەی خەسڵەتە خراپەکان. لەمەڕ هاندانیش دەبێ بە هەمان شێوە بە پارێزبن، نابێ هەرگیز پێشوەخت بەڵێنی پاداشت بە منداڵ بدرێت. باشتروایە بابەتەکە لە چوارچێوەی دڵخۆشکردن و دیاریەکی سادەدابێت. ڕازی و خۆشحاڵ کردنی منداڵ نابێ وەك پاداشت لە بری ئاکاری باش پێشکەش بکرێت بەڵکو وەك ڕیورەسمێکی سروشتی لە هەڵ و

مەرجێکدا بێت بەبێ گوێدانە شایستەی و ناشایستەی دەبێ بۆی لەبەرچاو بگیرێ ئەو شتەی پێویستی پێی نییە، نابێ وەك پاداشت پێ ببەخشن.

مەبەستەکە پلە ڕێز دەکەین

دەبێ دیسپلین لە شێواز جوێبکرێتەوە. دیسپلین ئەنجامی پەروەردەکردن و شێواز ئامرازە. هەر لەبەر ئەوە شێواز بەو لۆکالانەوە بەستراوە کە دەشێ شێوەی جۆرا و جۆریان هەبێت. دەبێ هەر شێوازێك لە رووی مەبەست وردەکاری و روونبوون جیاواز بێ.

شێواز دەبێ لەگەڵ ژیاری دەروونی و ژیانی دەرەکی پەیوەندی هەبێت، وەکارخستنی شێواز لە فەزای کارکردن چالاکی خێزاندا، پێویستە بە هۆی فەرمان دەردەکەن و کنترۆڵی جێبەجێکردنی ئەنجامبدرێ. ئامانجی سەرەکی شێواز بریتییە لە وە سەریەکنانی کارگەری دیسپلینی راست و دروست. لە مڕووەوە پێویستە پتر لەهەر کاتێك لە هەڵەکان بترسین. لە شێوازێکی راستدا تەمبێ کردن پێویست نییە، هەورەك هاندانی نابەجێ دەبێ خۆی لێببوێردن. لە هەموو روویەکەوە باشتروایە پشت بە شێوازی راست ببەستن بە حەوسەلە و لە سەرەخۆیی چاوەڕوانی دەرئەنجامەکەی بکەن.



## گەمە

گەمە کردن بابەخێکی زۆری هەیە لە ژیانی منداڵدا، هەروەك بایەخی کار و چالاکی لە ژیانی گەورەکان، منداڵ لە گەمە کردندا چۆن باربێت لە زۆر رووەوە لە ئیش کردنیشدا هەروا دەبێت، پێگەیاندنی توخمێکی چالاکی داهاتوو پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ شێوەی گەمەکردنی منداڵیدا هەیە. کەسایەتی هەرتاکێك لە کامڵ بوونی گەمە و گواستنەوەی پلە پلەیان بۆ مەیدانی کار وێنادەکرێ. ئەم گواستنەوەیە زۆر هێواش و سستە لە ساڵەکانی سەرەتاییدا منداڵ پتر خەریکی گەمەکردنە، هەر گەمەیەکی لە سنووری سەرگەرمیەکی سادە تێناپەڕێت. دوای پشت بەستن خۆی فێری نانخواردن و جل و بەرگ پۆشین دەبێت. لەو خێزانانەدا کە لەسەر بوونیادێکی راست و دروست دامەزراون ئەم بابەتانەی کارکردن وردە وردە ئاڵۆزتر و تێکەڵتر دەبن. ئەرکی دژواتر بە منداڵ دەسپێردرێ. دیارە سەرەتا لە سنووری سەرگەرمکردنیدایە دواتر ئەرکی ئەوتۆ بە منداڵ دەسپێردرێ بۆ تێکرای خانەوادە بایەخدارە. لە قۆناغی پێش سەرەتایی گەمەکردن بەشێکی سەرەکی وەختی منداڵ پڕدەکاتەوە، پتر لەهەر شتێك سەرنجی رادەکشێت و هۆگری دەبێت. لەو تەمەنەدا کە دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی. ئەرکی قوتابخانەی بەشی هەرە زۆری وەختی داگیردەکات ئەوسا بەرپرسیەکی پتر و جدیتری هەیە. لەو تەمەنەدا کار پەیوەندی لەگەڵ وێناندنی روون و دیاریکراوی ژیانی داهاتووی منداڵ پەیدادەکات. ئیتر ئەوە لەو جۆرە کارانەیە کە لە چالاکی کۆمەڵایەتییەوە نزیکە، هێندێك جار یاری کردن پتر لە کارکردن سەرنجی رادەکێشێ، حەزدەکا کارەکەی وەلانێ و خەریکی گەمەکردن بێت جاری وایە ناچارە لە ئاست ئەم دوو دژ پێکانە دان بە خۆی دابگرێت. سەرهەڵدانی ئەم پێکناکۆکییە ئەوە دەگەیەنێ کە پەورورەردەکردنی لەمەڕ یاری و بابەتەکانی کار راست جێگای خۆی نەگرتووە و

دایك و باوك نەیانتوانیوە ئەم دوانە بە گونجاوی ئاوێتەبکەن. لێرەوە دەردەکەوێ ڕێنوێنی کردنی منداڵ لە گەمەکردندا تا کوێ بایەخی هەیە. لە ژیاندا تووشی کەسانێك دەبینی کە دەمێکە قوتابخانەی سەرەتاییان تەواوکردووە کەچی هێشتا پتر لە کارکردن هۆگری یاری کردنن. زۆرینەی ئەو رای بە دوای خۆشی و رابواردنەوەن و کاریان لە پێناوی بەزم و شادی پشت گوێ دەخەن ئەوانەی خۆیاندەنوێنن و شانداغی بەسەر ئەوانی دیکەدا دەکەن، ژیان بە گاڵتەجاری دەبەنە سەر بێ هیچ ئامانجێك درۆدەکەن لەم جۆرە کەسانەن. ئەوانە لە کاتی منداڵیدا پایە و بنەماکانی گەمەکردنیان گواستتۆتەوە ناو ژیانی راستەقینە خۆیان هەر لەو کاتەوە نەیانتوانیوە پایە و بناغەکانی یاریکردن بەشێوەیەکی رێك و پێك لەگەڵ بابەتەکانی کار و چالاکی ئاوێتە بکەن واتە باش پەروەردە نەرکراوان.

تێکڕای ئەم وتانە ئەوە  ناگەیێنێ کە دەبێ هەرچی زووتر تائەو جێگایەی بکرێت منداڵ لە گەمەکردن دووربخرێتەوە و رووبکاتە کار و چالاکی و هەوڵدان، ئەم کردەیە هیچ داهاتێکی نابێت. ئەمە تەنیا زۆرەملێ و چەوساندنەوەی منداڵە، وادەکات پتر لە کار بێزار و هۆگری گەمەکردن بێت. پێگەیاندنی رەسەنێکی چالاك نەك لە نابێ دوورخستەوەی منداڵ لە گەمەکردن خۆی بنوێنێ، بەڵکو پێویستە گەمە و یاری ئەوتۆی بۆ برەخسێنرێ لەگەڵ یاریشدا تۆوی چالاکی کارکردنی داهاتوو بچێنێ.

بۆ ئەوەی لە پەروەردەکردندا گەمەکردنی منداڵ ئاراستە بکرێت پێویستە بیر لەوە بکرێتەوە کە گەمەکردن چییە و چ جیاوازیەکی لەگەڵ ئیش کردن هەیە. ئەگەر دایکان و باوکان بیر لەم بابەتەنەکەنەوە بە باشی هەڵگێڕ و وەرگێڕی نەکەن ناتوانن ڕێنوێنی بکەن، لەهەر بوارێکدا سەریان لێدە شێوی و دەرئەنجامی ئاوەژوو دەدا بەدەستەوە، بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئەوە بڵێین کە جیاوازییەکی زۆر وەك هێندێك وێنایدەکەن لە نێوان گەمە و کاردانییە. گەمەی چالاك وەك ئیش و کاری



چاکە، گەمەی خراپ و هەڵە وەك کاری خراپ وایە. ئەم لێکچوونە تا ئەو ئەندازەیەیە کە دەتوانین شیلگیرانە بڵێین کاری گەند پتر لە یاری خراپ دەچێت تاکاری باش.

لە هەر گەمەیەکدا پێش هەر کار و چالاکییەك هەوڵ و تەقەللای فکری مەبەستە. ئەگەر ورچێکی بووکەڵە ئاسا بۆ منداڵەکەت بکریت ئەوا بە درێژی رۆژ دوای کۆککردنی بەرەڵای دەکات بۆ خۆی بروا. لە بەیانییەوە تا ئێوارە پێی خۆشحاڵ دەبێ و سەیری دەکات. ئەم گەمەکردنە هیچ بیرکردنەوەیەکی تێدانییە. وەك توخمێکی وەستا و هەموو بەشداریکردنەکەی بۆتە تەماشاکردن. ئەگەر منداڵەکەتان بەم جۆرە گەمانە بخافڵێ، لە داهاتوودا کەسایەتییەکی دەست و پێ سپی لێدەردەچێت، کەسێك کە راهاتووە تەنیا چاو لە کاری خەڵکی بکات لە هەر چالاکییەك بێبەشە ناتوانێ لە کاری خۆیدا داهێنەربێت، خووی نەگرتووە بەسەر گرفتەکانی خۆیدا زاڵبێت. گەمەی بێ هەوڵدان بێ چالاکی راستەوخۆ هەمیشە گەمەیەکی خراپە، وەك تێبینی دەکەن لێرەدا گەمەکردن لە کارکردن دەچێت. گەمەکردن منداڵ شاددەکات ئەم شادییە یا شادی داهێنانە یا شادی سەرکەوتنە، یا شادی پەیوەست لەگەڵ جوانییە، گەمەی چاك هەموو جۆرە شادییەکان دەگرێتەخۆ، لێرەدایە دەبێ وێکچوونی تەواوی گەمە و کارمان لە بیردا بێ.

هێندێك پێیان وایە جیاوازی گەمە و کار لەوەدایە کە کار بەرپرسی تێدایە وەلێ لە گەمەکردن دانییە. ئەمە وانییە لە گەمە کردنیشدا بەرپرسی هەیە ئەلبەت لە گەمەی چاك و خراپدا کە دواتر بە درێژی لێیدەدوێم.

لەگەڵ ئەوانەشدا گەمە و کار لە چ روویەکەوە لێك ناچن؟

ئەم جیاوازییە تەنیا لەیەك شتایە، کار بەشداری کردنی ئادەمیزادە لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتییدا، لە وەدیهێنانی سەرچاوە مادییەکانی شارستانیەتی،

یا بە واتایەکی تر خولڤاندنی بەها کۆمەڵایەتییەکانە. بەڵام گەمە ئەم ئامانجانەی لێ شیننابێتەوە، پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە ئامانجە کۆمەڵایەتییەکانەوە نییە، بەڵکو پەیوەندییەکی ناراستەوخۆی هەیە، چونکە مرۆڤ لەگەڵ ئەم کۆششە جەستە و رەوانیانەی بۆ کار پێویستن رادێنێ.

ئێستا ئیتر روونە کە دایك و باوك سەرپەرشتی گەمەی منداڵاندا دەبێ چیبکەن؟

**یەکەم:** دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرن کە نابێ گەمە تا کە جوڵێنەری منداڵ بێت و لە مەبەستە کۆمەڵایەتییەکانی دووریبخاتەوە.

**دووەم:** بارهێنانی لەش و رەوان کە بۆ کار پێویستن لە منداڵدا بهێنرێتە دی.

ئامانجی یەکەم بەم شێوەیە بەدەستدێ کە وردەوردە منداڵ رادەکێشێتە ناو کار و پلە بە پلە کار بێ پاشەکشە جێگای گەمە دەگرێتەوە.

ئامانجی دووەم بە سەرپەرشتی و رێنوێنی راست و بەجێی، هەڵبژاردنی گەمەکان و یارمەتی دانی منداڵ بەدەستدێ.

لەم باسەماندا لە ئامانجی دووەم دەدوێن، ئامانجی یەکەم کە ئیشی منداڵە بۆ باسێکی جیای بە جێدێڵین.

لە زۆر رووەوە لەگەڵ کارلێکی هەڵەی دایك و باوك لەمەڕ رێنوێنی گەمە کردنی منداڵ رووبەڕوو دەبێتەوە بەم هەڵەیە سێ شێوەی هەیە. هێندێك هەرگیز هەقیان بەسەر گەمە کردنی منداڵەکانیانەوە نییە پێیان وایە منداڵەکانیان دەزانن چۆن گەمە بکەن.

منداڵی ئەمجۆرە دایك و باوکانە هەر چۆنێك بیانەوێ هەر کاتێکی پێیان خۆشبێ گەمان دەکەن و خۆشیان پێداویستی گەمە کردنیان هەڵدەبژێرن و رێك و پێکی دەکەن، دەستەیەکی تر لە دایکان و باوکان لە سنوور بەدەر گوێدەدەنە گەمەی



منداڵەکەیان هەمیشە دەست لە گەمەکەی وەردەن، رێنوێنی دەکەن و لە بواری گەمە کردن لێیان دەپرسن، بەڵام پێش ئەوەی وەڵام بدەینەوە خۆیان وەڵام دەدەنەوە خۆشحاڵ دەبن، منداڵی ئەم جۆرە دایك و باوکانە جگە لە ملکەچی دەستورەکان هیچ کارەنین و تەنیا لاساییان دەکەنەوە. لە راستیدا لێرەدا دایك و باوك پتر لە منداڵەکەیان خەریکی گەمە کردنن، خۆ ئەگەر منداڵەکەیان سەربەخۆ شتێك دروستبکات یا هەوڵ و تەقەلای خۆی بنوێنێ بۆ خولڤاندنی شتێك ئەوا دایك و باوك لە تەکیان دادەنیشن دەڵێن: ئاوانابێ، سەیرکە، دەبێ ئاوابێ.

ئەگەر منداڵەکە پارچە کاغەزێك ببڕێت، ماوەیەك سەیری دەکەن و دوای مقەستەکەی لە دەستدەردێنن و دەڵێن: بماندەیە بۆت ببڕین، چاو چۆن دەرچوو؟

منداڵ سەیر دەکات و دەبینێ کە لە راستیدا دەسکردی باوکی لە کارەکەی ئەو باشترە، ئەوسا پارچە کاغەزێکی تر دەداتە دەست باوکی و داوا دەکات پارچەیەکی تر ببڕێت و باوکیشی کە لە سەرکەوتوویی خۆی خۆشحاڵە گورج کارەکەی بۆ دەکات. منداڵی ئەم جۆرە دایك و باوکانە تەنیا کارەکانی دایك و باوکیان دووبارە دەکەنەوە. لەگەڵ ئەوە رانایەن خۆیان بەسەر گرفتی خۆیاندا سەرکەون و سەربەخۆ ئاکارەکانی خۆیان گەشە پێبدەن، هەرزوو خوو بەو ئیدەوە دەگرن کە تەنیا گەورەکان دەتوانن کاری باش ئەنجامبدەن. لەم منداڵانەدا لە خۆڕانە دیێن پشت نەبەستن بە هێز و توانایی خۆیان و ترسی سەرنەکەوتن گەشە دەکات.

دەستەی سێهەم پتر بیر لە بڕ و ئامرازەکانی گەمە کردن دەکەنەوە پارەیەکی زۆر بۆ کڕینیان خەرج دەکەن ئامرازگەلێکی یاری جۆراو جۆریان وەپێش دەخەن لەگەڵ ئەوەشدا خۆیانهەڵدەکێشن کەماڵەکەیان لە دوکانێکی فرۆشیاری یاری منداڵان دەچێت، ئەو دایك و باوکانەش حەزیان لەو ئامێرە خودکارانەیە و خۆشیانی پێوە دەخافڵێنن. منداڵەکانیشیان وەك ئارەزوومەندانی کۆکردنەوەی ئامرازگەلێکی

گەمان بە دوای بابەتێکی تری گەمە کردن دادەچن و بەبێ حەز و ئارەزوو گەمەیان پێدەکەن، خەراپیان دەکەن و دەیانشکێن و دوایی داوای یەکێکی دیکەدەکەن. رێنوێنی گەمەی منداڵ بیر و بۆچوونی دروستکردن و پێکەوەبەستنی بە پارێزی گەمە و کاری گەرەکە.

گەمەی منداڵ بە چەند قوناغدا تێدەپەڕێت، لە هەر قۆناغێکی شێوازێکی تایبەتی رێنوێنی پێویستە. قۆناغی یەکەم جێگاییەکی نەگۆر و کەڵك وەرگرتن لە ئامرازگەی گەمە کردن. ئەمەش لە تەمەنی ٥-٦ ساڵی کۆتایی دێت لەو ماوەیەدا دیارە منداڵ تەنیا حەزی لە گەمە کردنە، بە دەگەمەن رێگە دەدات یەك دوێك لە دۆستەکانی بەشداری بکەن. حەزدەکا بە کەل و پەلەکانی خۆی گەمان بکات نەك بەهی ئەوان دی. رێك لەم قۆناغەدا هەر گەمان دەکات. دوورنییە هەستی خۆپەرستی لە دەروونیدا گەشەبکات دەبێ لێبیگەرێی درێژە بە گەمان بدات، بەڵام ئاگادار بن ئەم قۆناغە درێژە نەکێشێ، لە کاتی خۆیدا بێ بنێتە قۆناغی دووەم. لە قۆناغی یەکەمدا توانای گەمەی بە کۆمەڵی نییە لەگەڵ دۆستەکانی پتر بە کێشەدێت، پەیوەندییەکی هاوبەشیان لەگەڵ نادۆزێتەوە. لەم بە تەنیای گەمەکردنەدا پێویستە ئازادی بدرێتێ هاوەڵی بەسەردانە سەپێندرێ. چونکە ئەم بەسەرداسەپاندنە لە کاتی گەمە کردندا دەبێتە هۆی تێکدان و خوگرتن بە تورە بوون و ناکۆکی دروستکردن.

راست و رەوان دەتوانین بڵێین: منداڵ لە تەمەن کەمیدا چەند باشتر بتوانی بە تنایی گەمان بکات لە داهاتوودا ئەوەندە کۆمەڵایەتی دەبێت، لەم تەمەنەدا لە رووی بەگژاچوون و هێرش کردنە سەر جیاوازە. بە واتایەکی تر (پاواخوازە). باشترین مێتۆد لەم کاتانەدا ئەوەیە نابێ رێگەبدرێت لەسەر دڕدوندەرگی و بیری پاواخوازی مەشق بکات. منداڵە بە گەمە کردن توانا و شایستەیی خۆی کاملدەکات. وەلێ ئەگەر بە پێچەوانەی ویستی خۆی لەگەڵ گەمەیەکی بە کۆمەڵ بخرێ، ناتوانێ لە



هەستی دڕدۆنگی و خۆشەویستی خۆی دابڕێ. هێندێك منداڵ زووتر و هێندێکیان درەنگتر هەستی گۆشەگیری و تاکڕەویان دەگورێ بۆ دۆستایەتی هاوەڵان و گەمەی بە کۆمەڵ. دەبێ یارمەتی بدرێ تا ئەم قۆناغە گواستنەوەیە بە باشترین شێوە بیرێ، و هەوڵبدرێ هاوڵەکانی لە کەش و هەوایەکی لە بار و گونجاودا پتر بکرێن. بەشێوەیەکی ئاسایی گەیشتنە قۆناغی دووەم لە ئارەزووی گەمەی پر جموجۆڵ و هەوای ئازادا خۆی دەنوێنێ. لە دۆخێکی ئاوادا بوونی منداڵێکی بە تەمەن تر کە بتوانێ کۆنترۆڵی گەمەکان بکات سوودمەندە. رێنوێنی کردن لەم قۆناغەدا سەخت و دژوارە چونکە منداڵ لەبەرچاوی دایك و باوك نییە، بەڵکو پێی ناوەتە مەیدانێکی بەرفراوانتر. ئەم قۆناغە تا تەمەنی ١١-١٢ ساڵی دەخایەنێ و برێکیش لە وەختی قوتابخانەی سەرەتایی وەخۆدەگرێ.

قوتابخانەی سەرەتایی ئاوەڵگەلێگی زۆر بۆ منداڵ پەیدا دەکا. گەلێك ئارەزوو و مەیدانگەلی بەربلاوتر دەرەخسێنێ لەوانە جموجۆڵی گەمە و یاریکردن. وەلێ قوتابخانەی سەرەتایی پێکهاتەیەکی ئامادە و وردتری هەیە کە خاوەن شێوازێکی دیاریکراوە. جگە لەوەش پەروەرکاران رەوانناسان یارمەتی دەدەن و هاوکاری دەکەن.

هەر لەم قۆناغەدا منداڵ وەك ئەندامێکی کۆمەڵگا هەنگاوهەڵدێنێ. وەلێ کۆمەڵگایەك کە هێشتا منداڵانەیە نە دیسپلینی توندی هەیە نە کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی. قوتابخانەی ئەمیش و ئەویشی پێدەبەخشێ کە هەردووکیان شێوەیەکن لە گواستنەوە بۆ قۆناغی سێهەم.

لەم قۆناغەشدا واتە قوناغی سێهەم منداڵ وەك ئەندامێکی کۆمەڵگا هەنگاوهەڵدێنێ بەڵام ئەمەیان تەنیا لە گەمە کردندا کۆنابێتەوە بەڵکو لەگەڵ کار و کارامەیی پەیوەستە. چونکە گەمە کردن قورستر و لەسەر نەزم و رێوشوێن دەبێ

و وردەوردە دەگۆڕێ بۆ یاری وەرزشی. واتە ئەو یاریانەی پەیوەندیان لەگەڵ ئامانجگەلی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا هەیە کە بە یاساگەلی تایبەتەوە لە هەموو ئەوانەش گرینگتر بە تێگەیشتن و ئارەزوو و دیسپلینەوە بەندن. لە تێکڕای ئەم سێ قۆناغەدا کارلێکی دایك و باوك بایەخێکی مەزنیان هەیە. ئەو کارتێکردنە بە پلەی یەکەم دەبێ لە قۆناغی گاڵتە و گەمە کردنیاندا هەبێ، ئەو قۆناغەی جگە لە خێزان منداڵ هیچ پەیوەندییەکی دیکەی نییە، لە دایك و باوك بەو لاوە هیچ کەس سەرپەرشتی نییە. بەڵام لە قۆناغەکانی تر دەکرێ کاریگەری دایك و باوك گرینگتر و مەزنتر بێ.

لە قۆناغی یەکەم بنچینەی ماددی گەمەکان بریتییە لەم ئامرازانەی خوارەوە:

ئامرازگەلی ئامادەکراوی میکانیکی سادە وەك ماشێن، کەشتی، ئەسپ، بووکەڵە، ورچ و ئەو ئامرازانەی جموجۆڵیان هەیە.

ئامرازگەلی نیوە ئامادە کە پێویستیان بە کار و کۆشش هەیە وەك نیگارکێشان یا وێنەی پارچە پارچەکراو کە دەبێ پێکەوە بلکێنرێنەوە. شەشپاڵو، کەرەستەکانی دروستکردنی خانووچکە و ئارەزووی دەرهێنانی مۆدێلی جۆرا و جۆر.

ئامرازگەلی سێهەم بریتین لە: گل (خۆڵ)، لم، پارچە مقەبیا، تەختە و لەتکە کاغەز، گیا، تەل، پێچ، کە هەریەك لەمانە لایەنی چاك و خراپی تایبەت بە خۆیان هەیە. ئامرازگەلی ئامادە لایەنی چاکی لەوەدا دەردەکەوێ. منداڵ لەگەڵ بیرکردنەوە و ئامێری ئاڵۆز ئاشنا دەکات و بەرەو بابەتی دروستکراو و بەرهەمی ماددی رایدەکێشێ.

پانتایی وێناندنی منداڵ بەرینتر دەکات. ئامێرێکی هەڵمی گواستنەوە بۆ منداڵ بابەتی گواستنەوە بارهەڵگری وێنادەکا. یادیتنی ئەسپ ژیانی ئەو ئاژەڵە، بە خێوکردنی، ئالیکدانی، لە زەینی منداڵدا وەدیدێنێ. دایك و باوك دەبێ وریابن کە



ئەو لایە باشانەی منداڵ لە واقیعدا دەیانبینێ بەشێوەیەکی ئەوتۆ بێ، کە تەنیا سەرنج نەداتە یەکلایەنی واتە لایەنی میکانیکی و ئاسانی کارکردنەکەی.

گرنیگ ئەوەیە منداڵ لە خۆبایی نەبێت بڵێ دایە و باوە ئەم ئامێرە یادەبات ئامێری ئاوایان بۆ کڕیوم و منداڵانی دیکە ئامێرگەلی ئاوا لە باریان نییە. بە گشتی ئەو پێداویستیانەی گەمەکردن ئەو کاتە بە کەڵکن کە منداڵ گەمەیان پێ بکا نەك هەڵیانگرێ و لە لای هاوەڵەکانی خۆیان پێوەهەڵێن. نابێ لە گەمە پێکردنیان تەنیا سەیری هاتووچۆیان بکات بەڵکو دەبێ بە کردەی ئاڵۆزتریانەوە ببەستێ. بۆ نموونە ماشێنەکان دەبێ بارهەڵگرن نەفەربار بکەن، یا کارێکی وابکەن بووکەڵەکان بخەون و بێدارببنەوە، جل و بەرگ بپۆشن و بچنە میوانی، یا فلان کاری بە کەڵك لەو بوارەدا ئەنجامبدەن. بۆ راهێنانی بیر و خەیاڵی منداڵ ئەم ئامرازانە مەیدانێکی پان و بەرینن. تا هێزی خەیاڵ یا بیرکردنەوە بەرینتر و جدیتر بێت باشترە، ئەو ورچۆکە مورمیشکراوەی تەنیا هەڵدەپەڕێ و دەوەستی سوودی نییە. وەلێ ئەگەر جێگایەکی تایبەت بۆ ژیانی ئامادەکرابێ، یا کەسێك بترسێنێ یاتەوقە بکات ئەوا کارێکی پۆزەتیڤ دەکاتە سەر خەیاڵی منداڵ.

بەشی دووەمی ئامرازەکانی گەمە کردن لەو رووەوە بە کەڵکن منداڵ لە بەرابەر پرسێکدا تووشی رامان دەکا، کە دەبێ گوشار بخاتە سەر هێزی هۆش و بیرکردنەوەی. ئەمە یەکێکە لەو پرسانەی خۆی کە هێشتا نەیتوانیوە گەڵاڵەیان بکات.

حەڵکردنی ئەم پرسانە پێویستیان بە دیسپلین و نەزم و رێکوپێکی و یاساگەلێك هەیە بۆ پێکەوە بەستنی بەشە جیاجیاکان لە بیر و خەیاڵی منداڵدا. لێرەدا تەنیا فاکتەر هێزی بیری ئازاد نییە. بەڵکو کەم و کوڕی ئەم ئامرازانەی گەمە کردن

ئەوەیە هەمیشە یەکسان و هاڕمۆنێکین لە ئەنجامی دووبارە بوونەوەیان بێزاری سەرهەڵدەدا.

بەشی سێهەم لە ئامرازەکانی گەمە کردن بریتین لە بابەتی جۆرا و جۆر کە هەرزانترین و سوودمەندترین ئامرازی گەمە کردنن، لە چالاکی سروشتی مرۆڤ نزیکن لەو بابەتانەن مرۆڤ شارستانیەت و بەهاکانیان پێ دەخوڵقێنێ. ئەگەر منداڵ بتوانێ گەمەیان پێبکا مانای ئەوەیە خاوەن بەهرەیە و لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی داهاتووشدا ئەم بەهرەیەی دەبێت. ئەم ئامرازگەلە مادییانە واقیعیبنی زۆریان تێدایە لە هەمانکاتدا مەیدانێکی پان و پۆڕی بیرکردنەوەن، بەڵام نەك توانای وێناندنێکی سادە بەڵکو بیر و خەیاڵی مەزن و داهێنەر. ئەگەر شەپکەتەختە و لەتکە شووشەیەك هەبێت دەتوانرێ پەنجەرەیەك دروستکرێ، بۆ ئەمەش دەبێ بیر لە چوارچێوەیەکەی بکرێتەوە، سەرئەنجام بیرۆکەی دروستکردنی خانووچکە وەدیدێ. یا ئەگەر گوڵ و بنکە گیایەك هەبێت باغ لە دایك دەبێت.

کام دەستە لەو ئامرازگەلانەی گەمە کردن لەوانی دی گرینگترن؟.

وێدەچێ باشترین ڕێگە ئاوێتەکردن و پێکەوە گرێدانی هەرسێ دەستەکە بێت، وەلێ نابی هەرگیز زۆربێت.

بۆ منداڵی کور یا کچ یەك دوو ئامرازی میکانیکی گەمە کردن بەسە. لەگەڵ ئەمەی هەیە ئامرازەکانی دەستەی دووەم و سێهەمی بخرێتەسەر پەرێزی ئامرازگەلی گەمە کردن کاملدەبێت. لە لایەکی دیکەوە نابێ ژمارەیان ئەوەندە زۆربێت منداڵی سەری لێبشێوێ و دەستە پاچە لە نیو ئەو هەموو ئامرازگەلە دابێت. ژمارەیەکی کەمی بدەرێ تابەو بڕەکەمە گەمان بکات، دوای بێ ئەوەی ئاگادار بێت چاودێری بە هەولبدە خۆی بە تەنیا هەست بە کەم و کوڕی گەمەکەی بکات و داواکاری کاملکردنی بێ. ئەگەر ئەسپێکی بچووکت بۆ کری و خەریکی



بارکردنی بوو ئاساییە هەست بە نەبوونی عەرەبانەکەی بکات. بۆ کڕینی ئەم ئامرازەی بارلێنان پەلەمەکە هەولبدە خودی منداڵەکە سەربەخۆ ئەم عەرەبانەیە لە قوتویەك یا پارچە مقەبایەك دروست بکا. ئەگەر توانی دروستی بکا ئەوا زۆرباشە گەیشتوویە مەبەست. وەلێ ئەگەر پێویستی بە چەند ئامرازگەلی بارلێنان بوو نەیتوانی هەموویان دروست بکا کارێکی وامەکە خەریکی دووەمیشیان بێت دەتوانی بۆ بکڕێ.

لە گەمەی منداڵان لە هەموو شتێك گرینگتر گەیشتن بەم ئامانجانەی خوارەوەیە:

١- منداڵ بە راستی یاریبکا، دروستکا، گەڵاڵە بکا.

٢- لە بابەتێکەوە نەچێتە سەر بابەتێکی تر بێ ئەوەی ئەوی پێشوو تەواو بکات، با هەمیشە کارەکەی بگەیەنیتە کۆتایی.

٣- لە هەر ئامێرێکی گەمەکردندا بە های دیاریکراو و پێویستی داهاتوو بدۆزێتەوە، بیباتەوە ئەو جێگایەی ئامرازەکانی گەمە کردنی خۆی لێیە و هەڵیبگری، هەمیشە رێك و پێکیان بکات جێگاکەیان خاوینکاتەوە. نەیانشکێنێ ئەگەر شکان دەبێ چاکبکرێنەوە ئەگەر بۆ منداڵەکە سەخت بوو پێویستە بە یارمەتی دایك و باوك ئەو کارە ئەنجام بدات.

دایك و باوك دەبێ سەرەنجی تایبەت بدەنە پەیوەندی منداڵ و ئامرازەکانی گەمە کردنی. منداڵ نابێ بیانیشکێنێ پێویستە خۆشیبووێن، خۆ ئەگەر شکان با زۆر پێی دڵتەنگ نەبێت. ئەم مەبەستە ئەو کاتە دێتەدی کە منداڵ خۆی بە خاوەنی راستەقینەی بزانێ. پێویستە لە زەرەر و زیان نەترسی، هەست بکا توانای پڕکردنەوەی کەلێنی ئەم بەدبەختی هەیە. ئەرکی دایك و باوك هەمیشە ئەوەیە لەم کاتانەدا بە هانای منداڵەکەیانەوە بچن کارێکی وابکەن هیوابڕ و نەبن پیێ بسەلمێنن رەنج و هۆشی ئادەمیزاد هەمیشە دەتوانێ شوێنە خراپەکان چاکبکاتەوە.

ئێمە پێشنیار دەکەین دایکان و باوکان هەمیشە ئامرازگەلی منداڵەکانیان دوای ئەوەی کەلکی چاککردنەوەیان پێوە نەما فڕێیان بدەن. لە بواری گەمە کردن تا ئەوە سنوورەی دەکرێ ئازادی کار بدەنە منداڵەکەیان وەلێ تا ئەو کاتەی دڵنیان گەمەکە بە راست و دورستی ئەنجام دەدرێ.

بەڵام ئەگەر لە جێگایەکدا منداڵەکە تووشی گەرفت بوو یا گەمەکە زۆر سادە و سەرنج راکێش نەبوو یارمەتی بدەن و رێنونی بکەن گەمەیەکی سەرنج راکێشتری بۆ گەلاڵە بکەن مەبەستێکی نوێتر بخەنە ناو گەمەکەی، هێندێك جار لە گەمەکەشدا بەشداری بکەن.

قۆناغی دووەم وشیاری پێری گەرەکە. بۆ نموونە منداڵەکەت لە حەوشەی ماڵێدا لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵ دایە پێویستە بە وردی بزانی ئەو منداڵانە چۆن منداڵێکن یا کچوڵەکەت دەچێتە دەرماڵێی بۆ نیو دەستە خۆشکەکانی ئێوە دەبێ ئەو کیژانە باش بناسن، بزانن ئەو منداڵانەی لەگەڵ رۆڵەکانی ئێوەن هۆگری چین و چییان کەمە گەمەکانیان چ کەم و کورییەکی هەیە. زۆر جار سەرنج دان هۆشیارییە، ئەمەش گرووپی ئەو منداڵانە بەرەو ژیاری لەبار دەبا. ئەگەر دیت منداڵەکەت لە وەرزی زستاندا لەسەر بەستەڵەکی تەپۆلکەیەکی خلیسکە دێتە خوارێ. دەبێ لەگەڵ سەرپەرشتی منداڵەکانی تر لەم بارەوە بدوێن بەڵێنیان لێوەربگرن، ئەگەر نەتتوانێ بە تەنیا تەپۆلکەکە داپۆشی ئەوا سندوقچەیەکی سادەی تەختە بۆ منداڵەکەت دروستبکە ئەوسا دەبینی منداڵەکانی دیکەش ئەو کارە دەکەن. لەم قۆناغەدا پەیوەندی لەگەڵ دایك و باوکی منداڵان گرنیگ و سودەبەخشە کە بەداخەوە ئەم پەیوەندییە لەناو دایکان و باوکانی منداڵ گەلێك کەمە. لەو بارەو دێتەپێش سەرپەشتی منداڵ لە گەمەکردنی منداڵەکەی لەگەڵ منداڵەکانی تر لە حەساری ماڵێدا نارازییە بەڵام لەم رووەوە لەگەڵ دایك و باوکی ئەوانی تر نادوێ تا بیرێك لە چاککردنی گوزەرانی منداڵەکانیان بکەنەوە لە



کاتێکدا ئەم کارێکی دژوار نییە و لە توانای هەر کەسێکدا هەیە. لەم قۆناغەدا گەلێك گەمەی تایبەتی بە کۆمەڵ سەر هەڵدەدەن ئەگەر دایك و باوکان بە کۆمەڵ رابەرایەتیان بکەن بە کەڵکە.

هەر لەم قۆناغەدا دەبینین منداڵان زۆر بە گژیەکدا دێن و پێکهەڵدەپرژێن سکاڵا لە یەکتری دەکەن. ئەگەر دایك و باوکی ئەم منداڵانە یەکسەر لایەنی منداڵەکەیان بگرن خۆشیان لەگەڵ دایك و باوکی منداڵاکانی تر بە کێشەبێن ئەوا هەڵەیەکی گەورە دەکەن.

لە منداڵەکەتیان داو بە چاوی بە فرمێسکەوە هاتەوە کە دیتت ئازاری هەیە و توڕەیە، هەرگیز توڕەمەبە و بە پەلە، رامالّی دایك و باوك ئەو منداڵانە مەکە کە ئازاری منداڵەکەتیان داوە. بەر لە هەموو شتنێك لە کچەکەت یا کوڕەکەی خۆی بپرسە و بزانە رووداوە، چۆن بووەو لە بەرچاوی خۆت وێنای بکە. چونکە کەم واهەیە تاوانبار هەر لایەنێك بێت. گومانی تێدانییە منداڵەکەی تۆش توند و تیژی نواندووە، تێبگەیەنە لە گەماندا چاو پۆشی و لێبوردنیش هەیە تادەکرێ لەسەرەخۆبن لە کێشە و ناخۆشیەکانیاندا و رێگای ئاشتی و ئاشبوونەوە رەچاوبکەن. هەوڵ بدە تادەتوانێ منداڵەکەت لەگەڵ حەریفەکەکەی ئاشکەرەوە، بەرامبەرەکەی بۆ ماڵی داوەت بکە لە گەڵیا بدوێ و رووداوەکەی بۆ باس بکە، لەگەڵ دایك و باوکیان ببەبە ئاشنا. بایەخی ئەم کارەت لەبەرچاو بێت لەگەڵ سەرپەرشتی منداڵەکانی تر هەوڵ بدەن پەروەردەیان بکەن تەنیا لەم کاتانەدایە پتر کەڵك بە منداڵەکەتان دەگەیەنن، لە هەمانکاتدا تەنیا هۆگری ماڵی نابێت. تێ دەگا ئێوە کردەیەکی کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدەن. ئەمە خۆی دەبێتە سەرمەشقی رەفتارەکانی. لێرەدا هیچ شتێك زیانبەخشتر نییە لەو توند و تیژیەی لەو رووداوانەدا دژی خانەوادەگەلی تر بەکاردێت. چونکە هەستی رق و کینە لە ئاکاری منداڵەکەدا، شەرەنگیزی، دوو دڵی و خۆپەرستی پەروەردە دەکات.

له قۆناغی سێهەمی گەمەکانی منداڵ هیچ کارێك له دەست دایك و باوك دانییه چونکه خراوته ئەستۆی دامەزراوه وەرزشی و قوتابخانەییەکان، تەنیا کاتێکردنی پۆزەتیڤ لەسەر منداڵ بۆ دایك و باوك دەمێنێتەوه. پێویسته وریاین وەرزش نەبێته ویست و ئارەزووی هەمەلایەنی منداڵ، لایەنەکانی تری چالاکی نواندیان نیشان بدەن. دواتر با تەنیا نغرۆی سەرکەوتنەکانی خۆی نەبێت بەڵکو لەوه گرینگتر پێویسته نغرۆی سەرکەوتنی گرووپی پێکهاته وەرزشییەکانی بێت، له هەمانکاتدا هەر جۆره هەستێکی خۆهەڵکێشان و له خۆبایی بوون هاوسەنگ بکرێت. و منداڵ رێز بۆ گرووپی حەریف دابنێ پێکهاته و دیسپلینی یاری لەبەرچاو بگرێ. لەمەڕ بردنەوه و دۆراندن هاوسەنگییەکی ئارام و ژیرانه له نێو تیپی وەرزشیان وەدیبێنێ. لێرەشدا گەلێك سوودبەخشه سەرپەرشتی منداڵ له نزیکەوه لەگەڵ تیپی وەرزشی کوڕەکەیان یان کچەکەیان ئاشنابن.

له هەر سێ قۆناغی گەمە کردن دەبێ دایکان و باوکان ئاگاداربن گەمە کردن سەرتاپا ژیان و رەوانی منداڵ هەڵنەلۆشێ، وێرای ئەوه خووگرتن بە کار و چالاکی گەلاڵە بکرێت. بە تێڕوانین له گەمەکانی هەر سێ قۆناغەکە پێویسته دایك و باوك پەسەندی تەواوی منداڵ وەدەست بینن هانیانبدەن زاڵ بن بەسەر گرفتەکاندا و توانای وێناندن و بیرکردنەوەیان گەشە پێ بدەن. له قۆناغی دووەم و سێهەم گەمەکان چاودێری بەردەوامیان گەرەکه چونکه لەم دوو قۆناغەدا پێ دەنێنه ناو کۆمەڵگا و نەك هەر ئەرکی سەرشانیەتی بە باشی یاری بکات بەڵکو خاوەن ئاکاری باش بێت لەگەڵ خەڵك.

ئەوەی لەم گوتارەدا ئاماژەمان پێکرد کورتی دەکەمەوه:

زۆربەی دایکان و باوکان بە تەواوی گوێنادەنه رێنوێنی گەمەی منداڵەکانیان یا بەرەڵلای دەکەن یا له گۆمی ئامرازگەلی گەمه و سەرگەرمیەکانیدا نقومی دەکەن،



پێویسته شێوازگەلی جۆرا و جۆر له قۆناغەکانی گەمەکردندا بدۆزنەوه وەلێ هەمیشه دەرفەتی سەربەخۆیی و کامڵکردنی توانایەکانی بدەنێ، وێڕایی ئەوەش له شوێنی پێویست و ئاستەنگدار له یارمەتی دان و پشتیوانی کردن خۆیان نەبوێرن.

له قۆناغی دووەم و سێهەم نابی خەریکی رێنوێنی گەمەکان بن بەڵکو دەبێ گوێبدەنه پەیوەندی منداڵ لەگەڵ خەڵك و گرووپ و دامەزراوەکان.

## پەروەردەکردن و ئابووری خێزان

یەکێك لە رەهەندەکانی پەروەردەکردن، ئاشناکردنی منداڵە لەگەڵ باری ئابووری، ئەگەر منداڵ نەزانی دەرامەتی خێزان لە کوێ وەدێ تەنیا خوبەوەوە بگرێت ویست و ئارەزووەکانی بە جێبگەیەنێ و گوێنەداتە ویست و ئارەزووی ئەوانی تر، ئەوا بوونەوەرێکی تاکڕەو باردێ. هێندێك لە دایك و باوکان بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن ئەو تاکڕەوییە لە منداڵەکەیاندا بە هێزدەکەن. پتر لە خەمی ئەوەدان منداڵەکەیان هەموو شتێکی هەبێت. باش نانبخوات، جل و بەرگی باش و رێك و پێك بپۆشی.. دەوڵەمەند بێ لە ئامرازگەلی گەمە کردن و رازی بێت. هەتتا زۆر جار خۆیان بێ بەش دەکەن لە کەل و پەلی پێویست. وەلێ هەست بە لێبوردەیی ئەوان ناکات، وردەوردە واخودەگرێ کە ئەو لە هەمووان گرینگترە و نیازەکانی لا دایك و باکو یاسان، لەم جۆرە خانەوادانەدا زۆربەی منداڵان ئاگایان لە کارو پیشەی دایك و باوك نییە، تەنیا خەمی جێبەجێکردنی ئارەزووەکانی خۆیانن.

ئەم رێبازە نابەجێ و زیانبەخشەی پەروەردەکردن پتر لە هەموو کەس دایك و باوك ئازار دەدات، تەنیا ئەو پەروەردەکردنەی لەسەر هەستی هاوکاری، هەرەوەزی بەندە شێوازێکی تەواوە.

بۆ ئەم مەبەستە ئەم خاڵانەی خوارەوە دەبێ لەبەرچاو بگیرێ:

١- تائەو ئەندازە دەگونجێ دەبێ منداڵ زووتر بزانێ کە دایك و باوك لە کوێ کاردەکەن و ئەو کارە چۆنە. لە یەکەمین دەرفەت پێویستە هێندی گرووپی پەیوەست و هاوکارەکانیان بە منداڵەکەیان بناسێنن، و بایەخی کارکردن لەگەڵ خۆیان روونبکەنەوە، خۆ ئەگەر یەکێك لە هاوکارەکانیان بە دڵنەبێت نابێ بە دەربرینی ئەو هەستە منداڵەکەیان بێزار و نیگەران بکەن.



بە گشتی تادەکرێ دەبێ منداڵ زووتر تێبگا ئەو پارەی دایك و باوك دەستیان دەکەوێ نە تەنیا ئامرازێکی ئاسوودەییە دەکرێ خەرج بکرێ بەڵکو کرێ کارێکی پڕ زەحمەت و بە کەڵکی کۆمەڵایەتییە.

کاتێك منداڵ گەورە تر بوو پێویستە بە وتەگەلێکی سادە و رەوان لە بارەی کار و پیشەی خەڵك و ئامانجەکانیان لەگەڵی بدوێن. ئەگەر دایك کابانی ماڵە دەبێ ئەم کارە بناسێ و بەرێزەوە سەیری بکات و بزانێ ئەم کارەش هەوڵ و ماندووبوونی تێدایە.

٢- تائەو شوێنەی دەکرێ پێویستە منداڵ بوجەی ماڵی بزانێ و ئاگای لە دەسکەوتی دایك و باوکی بێت، گەلاڵە و بەرنامەی ژیانی ماڵێ لێ نەشاردرێتەوە.

بە پێچەوانەوە بە کارامەییەوە وردەوردە سەرەنجی بۆ لای خاڵ دارایی ماڵی راکێشن و بابزانێ دایك و باوك چ شتێکیان پێویستە، دەبێ فێربێ چاو لە هەنێدێك پێویستەکانی بپۆشێ بۆ ئەوەی پێویستی ئەوانیتر دابین بکرێ.

٣- ئەگەر خێزان ژیانی خۆش و دەوڵەمەندە نابێ رێگەبدات منداڵەکەی لەبەر هەل و مەرجی ئاوا لە خۆی بایی بێت شاناغی بەسەر منداڵی دیکەدا بکات یا بە خانوو جل و بەرگەکانییەوە خۆی هەڵکێشێ، دەبێ بزانێ لە سەروەت و سامانی خێزاندا هیچ پایە و بەڵگەیەکی ئەوتۆ نییە خۆی پێوەرانێن. وەلێ ئەگەر خێزان لەبەر هۆکاری جۆرا و جۆر بە سەختی دەتوانێ پێویستەکانی خۆی دابین بکات، پێویستە بەشێوەیەکی ئەوتۆ مامەڵە بکرێت منداڵی ئەم خێزانە ئیرەیی بەوانی تر نەبا، دەبێ لەم خێزانەدا ئارامی و لەسەرەخۆیی، هەوڵ و کۆششی بۆ دابینکردنی داهاتوویەکی روون، هەستی لێبوردەیی، چاوپۆشی بکرێتە پیشە.

## ئابڕومەندی

ئابڕۆمەندی بریتییە لە پەیوەندیگەلی ئاشکراو یاوەریەتی راستی و دڵسۆزی. ئەگەر منداڵێك سێوێکی ویست و ئەم داوایەی بە ئاشکرا دەربڕی ئەوە خۆی لە خۆیدا ئابڕومەندانییە. وەلێ ئەگەر منداڵ ئەم ویستەی خۆی بشارێتەوە و چاویش لە سێوەکە هەڵنەگری و هەوڵبدا بە دزیەوە بێ ئەوەی منداڵان بیبنن پڕی داتێ ئەوە بێ ئابڕوییە. ئەگەر دایکێك بە دزیەوە بێ ئەوەی منداڵەکانی دیکە بیبینی بێ ئەوەی کەسی بێگانە ئاگاداربێ سێوێك بداتە منداڵەکەی ئەوە بە دەستی خۆی منداڵەکەی فێری فرو فێڵ دەکات.

تەنیا لە تەمەنی بەرەژوور دەبێ منداڵ هێنێدك رازی شاراوە و بزانی پێویستە بە شاراوەیی بیانهێڵێتەوە بە گشتی دەبێ هەرشتێك هەستی دەروونی کەسایەتی پێك دێنی بەنیهێنی بهێنێتەوە. وەلێ لە تەمەنی کەمدا هەتا منداڵ راستگۆتر و رازەکانی کە هەر چۆنێك خۆی پێیخۆشە، کەمتر بن، ئەوا تائەو ئەندازەیەی بۆ پەروەردەکردنی بە کەڵکترە.

دایك و باوك دەبێ بە وردی چاودێری گەشەی ئەم هەستە بن، هیچ شتێك بە ئەنقەست لە منداڵەکەیان نەشارنەوە و لە هەمانکاتدا منداڵەکەیان فێرکەن بێ مۆڵەت وەرگرتن هیچ شتێك تاونەداتێ. دەکرێ حەزی گەلێك شتی دلڕفێن لە دڵبگرێ، دەبێ فێر بکرێ ئارام و لەسەرخۆ دانبە خۆیدا بگرێ. لە هەمانکاتدا خێزان بابێ نارێکی تێدابێ. لە کەش و هەوایی نارێك و لێکترازاو هەستی سەربەخۆی لەمەڕ شمەك وەدیدێ و منداڵ هەرچی بیەوێ دەیکا و هیچکەسیش لێیناپرسێتەوە. بە مپێیە هەستی خاوەنداریەتی نهێنێ شتەکانی لا دروست دەبێ. ئەگەر ئەرکی کڕینی شتێکت پێ سپارد هەم لە جۆری شتەکە هەم لەو باقیەی دەیهێنێتەوە وردببەوە. ئەم کردەیەش ئەوەندە دووبارە بکەوە تا هەستی



ئابڕومەندی لە دەروونیدا وەدیدێ. دەبێ ئەم کۆنترۆڵکردنە هێندە بە ئەدەب و نزاکەتەوە بێ کە منداڵەکە واهەست نەکات گومانی لێدەکەیت.

بائامادەبیی‌وێڕای شادی و خۆشحاڵی بۆ دابەشکردنی گرفتەکان، بکرێتە پیشە، دایك و باوکانی خێزانێکی ئاوا نابێ لەبەرچاوی منداڵەکانیان بیکەنە پرتە و بۆڵە و دەمی سکاڵایان بکەنەوە. دەبێ تا بۆیان جەلوێ چالاك: و خۆشحاڵ بن هەمیشە هیوایان بە دوارۆژێکی باشتر بێت. هەر چاکسازیەکی واقیعی بێتە پێش پێویستە دیاربێ و پەنجەی بۆ درێژ بکرێت.

## مشوور و دڵسۆزی

ئەو شمەکانەی لە موڵکایەتی تایبەتی خێزاندان لەگەڵ تێپەڕبونی کات لە کاردەکەون پێویستە شتی نوێیان لە جێگادابنرێتەوە. ئەمەش پێویست بە کڕینی شتمەکی نوێ دەکا. سەرئەنجام برێك لە دەرامەتی خێزان لەو پێناوەدا خەرج دەکرێ. منداڵ دەبینێ چۆن هێندێك کەل و پەل دەڕزن و لە کاردەکەون و هێندێك کەل و پەلی دیکە جێگەیان دەگرنەوە. بەرێوەبەرێکی باشی خێزان نابێ رێگەبدا هیچ شتێك بەر لە کاتی خۆی لە کاربکەوێت، دەبێ لە کاتی خۆیدا چاکی بکاتەوە. تەنیا ئەو شتانە بکڕێت کە بەراستی پێویستن. ئەم کردەوانە بەشێك لە چالاکی مرۆیی پێکدێنن کەپێی دەڵێن مشوور خۆری و دڵسۆزی.

هەموو جۆرە مشوورە و دڵسۆزییەك کارێکی باش نییە، ئەوانەی سەراپایان ئەو هەستەیە لە ژێر کارلێکی ئەو هەستدا گەلێك خاڵی دیکە لە بیردەکەن هەمووان ئەزیەت و ئازاردەدەن. باشترین ئاکاری مشوور و دڵسۆزی نابی لە شێوەی رەزیلی و پیسکەیی دابێت. دەبێ منداڵ ئەم هەستەی لە پەیوەندییەکانی نێوان خێزاندا هەبێت بە تایبەتی لەمەڕ کالاّ گشتییەکانی ناو ماڵ.

هەستی مشوور و دڵسۆزی لە هەستی دەسپێوە گرتن و پاشەکەوتکردنەوەیە کە لەگەڵ پیسکەیی و ڕەزیلی جوێیە. دایك و باوك لە کاتی کەمتەمەنی منداڵەکانیان دەبێ ناوبەناوە لەگەڵ منداڵەکانیان لە بارەی ئەو شتانەوە بدوێن کە کاتی کڕینیان نزیك بۆتەوە، وە باس لەسەر چۆنیەتی دابین کردنی بکەن.

## ئاگالێبوون و پاراستنی شتومەك

ئەم شێوازە لایەنێکی تایبەتی هەستی مشوورخۆری و دڵسۆزییە. تەنیا ئەوە نەبێت کە مشور و دڵسۆزی پتر لە بیر و هێزی خەیاڵدایە. بەڵام ئاگالێبوون و پارێزگاری خوویە. ڕەنگە مرۆڤ تەواو دڵسۆزی و مشوری ماڵێ بخوات لە هەمانکاتدا خووی ئاگالێبوون و پاراستنی نەبێت. ئەم خووە تا ئەو جێگایەی دەشێ دەبێ زوو پەروەردەبکرێ. منداڵ دەبێ بتوانێ بێ ئەوەی جلەکانی پیس بکات نانبخوا. دەبێ بتوانێ بە جۆرێکی ئەوتۆ کەڵك لە پێداویستەکانی وەربگرێت کە نەپیسیان بکات و نەبیانشکێنێ. ئەم خووگرتنە گەلێك دژواری هەیە وەلێ هەر چۆنێك یا بەهەر بەهایەك بێت دەبێ سەقامگیربکرێت، ئەگەر ئەوە نەکرێ هەر جۆرە فێرکردنێك لەم ڕووەوە بێکەڵك دەبێ.

خووگرتن لە ئەنجامی مەشق و دووبارەکردنەوە سەرهەڵدەدا بەمپێیە پێویستە هەمیشە لە بیری مەشق کردنی ڕاست و دروستدابن. دەبێ منداڵ ئەوێندە خوو بە پێڵاوی خاوێنەوە بگرێت کە هەرگیز نەتوانێ پێڵاوی پیس لە پێبکات.

هەستی چاودێری پارێزگاری شتومەك نابێ هەر لە ئاقاست شمەکی شەخصی دابێت. دەبێ لە ئاست هەر شتێك کە موڵکی تێکڕای خەڵکە بە تایبەتی ئەو کەل و پەلانەی گشت کەڵکی لێوەردەگرێ ئەو هەستەی هەبێ. لەبەر ئەوە هیچ کات ڕێگای منداڵەکەت مەدە لەمەڕ شتە گشتییەکانی ناو شەقام. جادە و کۆڵان و پارکەکان کەمتەرخەمبێت و گوێیان نەداتێ.



## هەستی بەرپرسی

هەست بەلێپرسینەوە بەو مانایەیە کە منداڵ نەك بە هۆی ترس و تەمبێکردنەوە بەڵکو لە رووی بڕواو دڵسۆزی ئەرکەکانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێ و هەوڵی پارستنی کەل و پەل بدات. لەبەر ئەوە نابێ لەبەر خراپکردنی شتێك منداڵ تەمبێ یا هەڕەشەی لێبیکرێ، بەڵکو پێویستە مامەڵەیەکی وای لەگەڵ بکرێت خۆی ئەو زیان و زەرەرە ببینێ کە لە ئەنجامی کەمتەرخەمییەکەی وەدیهاتووە و خۆشی خەمی پێبخوات. دیارە لەم رووەوە پێویستە ئاخاوتنی لەگەڵ بکرێ کە بە هەند نەگرتن و گوێنەدانە شتومەك ئەم ئەنجامەی لێدەکەوێتەوە. باشتروایە خودی منداڵ لەسەر بونیادی ئەزموونەکانی خۆی بەو ئاکامە بگات. بۆ نموونە ئەگەر منداڵەکەت بووکەڵەیەکی شکاند لە کڕینەوەی شتێکی تر پەلەمەکە. شتە شکاوەکەش فڕێمەدە باماوەیەك لەبەرچاوی بێت دواتر چاکیبکەرەوە.

پێویستە دایك و باوك لەمەڕ چاککردنەوە، کەل و پەلەکان لەگەڵ منداڵ بدوێن لەگەڵ بەڵێنی چاکردنەوەی پێی بسەلمێنن کە ئەو هۆکاری ئەو رەنج و ئازارەیە.

لە کاتی ئاوادا تێدەگات کردەوەکانی رووداوی ئاوای لێدەکەوێتەوە. بەم پێیە هەستی بەرپرسی کەم کەم گەشەدەکات.

چرۆکردنی هەستی بەرپرسی لە ئاست ویست و ئارەزووەکانی ئەندامەکانی خێزان یا لە ئاست ویست و ئارەزووە کۆمەڵایەتییەکان گەلێك گرینگە. ئەگەر هەستی هاوکاری هاوبەش لەناو خێزاندا هەبێت پەروەردەکردنی ئەم هەستە زۆر دژوار نابێت.

## هەستی ڕێبەریکردن

ئەم توانایە بریتییە لە تێگەیشتنی تێکڕای بە شۆکەکانی دەمێکی دیاریکراو، ئەگەر کەسێك سەرگەرمی ئەنجامدانی کارێکە دەبێ ئاگاداربێ لە پاش و پێشیەوە کەسانی تر هەن خەریکی ئیشن.

هەستی ڕێبەدی کردن لە پەیوەندی نێوان کارەکانی ناو ماڵ بایەخێکی بانئاساییان هەیە، ئەو منداڵەی خەریکی کارکردنە نابێ کاری ئەوانی تر و کارەکانی تری خۆی لە بیر بچێ. کە سەرگەرمی گەمە کردنە پێویستە ئەوەی لە بیر بێ دەوروبەری شتومەکی ئەو تۆیان لێیە، ئاگاداری و مشوور خواردنیان گەرەکە. کە دەچێت شتێك بکرێت دەبێ بزانێ لە کاتی خۆیدا بگەڕێتەوە ماڵەوە.

خولقاندنی ئەم توانایە لە دەروونی مێرمنداڵێکدا واپێویست دەکا، نەك تەنیا فەرمانێك بەڵکو دوو یا سێ فەرمان پێکەوە یا فەرمانێکی ئاوێتەی بەسەردا بدرێ. بۆ ئەنجامدانی کارێکی مەرجدار سادەترین نموونەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

کانتۆری کتێبەکانت خاوێنکەرەوە و کتێبەکانیش بەپێی ناوی نووسەرەکانیان ڕێکبخە یا لەو دووکانە سوورە ماسی بکرە، ئەگەر پانە ماسی چاکت بەرچاوکەوت واز لە سوورە ماسی بێنە.

هەستی ڕێبەدیکردن لە ئەنجامی ڕاهێنانی بەردەوام لە کار و دڵسۆزی لەمەڕ ئیشی ماڵ و خێزان ئەو کاتە گەشەدەکات کە منداڵ شارەزایی تێکڕای کار و وردەکاری تایبەت بە ماڵ و منداڵ بێت.



## کارێزمایی

کارامەی بۆ ئەنجامدانی ئیش و کارە بەردەوام و درێژخایەکانی ماڵی وەدیدێت. لە تەمەنی حەوت هەشت ساڵیەوە گەلێکجاران زووتر ئەرکی درێژخایەن بە منداڵ دەسپێردرێ بۆ نموونە ئاودانی گوڵ و ڕێك و پێککردنی کتێب و دان ڕۆکردن بۆ کۆتر و .. چاودێریکردنی خۆشك و برای بچووکتر و گەلێك کاری دیکەی لەم بابەتە. بەشی پارەی ڕۆژانە بایەخێکی تایبەتی هەیە دەبێ لەگەڵ ئەوەدابین هەر ماڵێك تا ئەندازەیەك ئازادی خەرجکردنی پارەی ڕۆژانە بدا بە خودی منداڵ چ بۆ ویستەکانی خۆی یا پێویستی گشتی خێزان. بۆ ئەمەش مانگی چەند جارێك بڕێکی دیاریکراو بدرێتە منداڵ کە بە وردی بزانرێ بۆ چ مەبەستێك خەرج دەکرێ. لیستی ئەم خەرجییەش پەیوەندی بە تەمەنی منداڵەکە و توانای دارایی خێزانەوە هەیە.

بۆ نموونە مێرمنداڵێکی چواردەساڵان دەتوانێ لیستێکی ئاوای هەبێت: کڕینی دفتەر پارەی هاتووچۆ، پارەی صابون و میرددان بۆ تێکڕای خێزان، پارەی سینەما بۆ خۆی و برا گچکەی، تا منداڵەکە گەورەتر بێ لیستی ئەم خەرجیانە پتر ئالۆز و بەرپرسی زۆرتر دەبێ. دەبێ چاودێربن بزانی ئەو کوڕە یا ئەو کچە ئەم ئەرکەی چۆن بەجێدێنێ، ئایا کەڵکی خراپ لەم ئازادی پارە خەرجکردنە وەرناگرێ. خەرجکردنی واقیعی لەگەڵ خەرجی بۆ شەخصی خۆی یەکدەگرنەوە، هێندێك جار لە دیاریکردنی بڕی پارەکە و وردەکاری خەرجکردنی هەڵە ڕوودەدات، یا وادێتە پێش منداڵەکە لەم کارەدا هێندە جیدی نییە. لەوەها کاتێکدا پێویستە باس و گفتوگۆی لەگەڵ بکرێ هەڵەکانی پێ بسەلمێنرێ ڕێنوێنی بکرێ هەڵەکان ڕاست بکاتەوە. هەرچۆنێك بێ نابێ بە کنترۆڵ کردنی پەیتا پەیتا و متمانە پێنەکردن منداڵ بێزاربکرێ. تەنیا پێویستە ڕەفتاری لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەی بخرێتە ژێر چاودێری.

لەم بەشەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ شمەکی ماڵی و خانەوادەمان خستەبەر باس و لێکۆڵینەوە دایك وباوك دەتوانن بەپێی ئەزموونەکانیان گەلێك مەشق و راهێنان بۆ منداڵەکانیان برەخسێنن لە هەمانکاتدا دەبێ بزانن ئەندامێکی باش و هاوڵاتیەکی ئابڕوومەند پەروەردەکەن. گرنیگ ئەوەیە پەیوەندی لەگەڵ کەل و پەلی ماڵی و ماڵەوە لە بنچینەی هەستی هاوبەش لەگەڵ ئەوانی تر و پاراستنی بێدەنگی و ئارامی لەسەر بنچینەی نەزم و دیسپلین بێت. دوور بێ لە تووڕەیی و پرتە و بۆڵە، پتر چوست چالاکی، شادمانی و هەوڵی دۆستانە بۆ لەبارکردنی ژیاری خێزان رەچاوبکرێ.

کار و کردەی دارایی دەرفەتێکی گرینگە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ، دەکرێ لەم بوارەدا ئەم خەسڵەتە تایبەتیانەی خواوەرەوە بە هێزبکرێت:

**هەستی ژیانی هاوبەش لەگەڵ ئەوانی دی:** واتە هەستی هاوکاری راستەقینەی مرۆڤ لەگەڵ کار و داخوازییەکانی خەڵك و سەرتاسەری کۆمەڵ، لەم شێوازەدا نزیکردنەوەی منداڵ لەگەڵ فەزای چالاکی دایك و باوك، بەشداری کردنی لە سەرمایەی خێزان، دەستپوەگرتن لە کاتی بوونی سامانی مادییدا، شایستەیی و دانبەخۆداگرتن لە دەستکورتیدا، بە هێزدەبێ

**ئابڕوومەندیك:** واتە پەیوەندی راست و رەوان لەگەڵ کەس و شتومەك.

**مشوور و دڵسۆزی:** گوێدانەییدا ویستەکانی خێزان و بەرنامەدانان بۆ وەدەستیهێنانی.

**هەستی پارێزگاری:** واتە خووگرتن بە پارێزگاری کەل و پەل.

**هەستی بەرپرسی:** واتە هەستی تاوانباری لەمەڕ ئەو شتانەی بە هۆی لێنەهاتوویی خراپ دەبێ و لەناو دەچێ.



**هەستی رێبەدی:** توانای پارێزگاری چەند کۆمەڵ شت لە یەککاتدا.

**کارێزمایی:** شێوەی بەفیرۆ نەدانی کات و ئەنجامدانی کار.

## راهاتن لەگەڵ کار و کۆشش

پەروەردەکردنی راست و دروست لە کار و رەنجکێشان جیاناکرێتەوە. کار و کۆشش هەمیشە بنەمای ژیانی ئادەمیزاد بووە و بۆ وەدیهێنانی خۆشی شارستانیەتی خراوەتەگەڕ. کەواتە بابێین چەمك و بونیادی پەروەردەکردن لەتەك کار و کۆششی خانەوادەیە کالاّ و تاوتوێ بکەین.

منداڵ لە داهاتوودا دەبێتە ئەندامێکی کۆمەڵ، کەواتە بایەخی لە کۆمەڵگادا و بەهای وەك تاکێکی ناو نیشتمان پەیوەستە لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسە تاکۆێ توانای بەشداری کردنی لە کار و کۆششی کۆمەڵایەتییدا هەیە، جگە لەوە توانای ماددی (واتە سەرەوەت و سامانیش) هەر بەو بوارەوە بەندە. لە گۆرەپانی ژیاندا هێندێك خەڵك دەتوانن باشترین کاربکەن و زەحمەت بکێشن، ژمارەیەکیش تەنانەت توانای ئەنجامدانی ئاسانترین کاریان نییە.

هێندێکش توانای ئەنجامدانی کاری سەخت و ئاڵۆزیان هەیە کە پر بایەختریشە، ئەم جیاوازی پڕست و توانایە بە درێژایی ژیان بە تایبەتی لە تافی لاویەتیدا گەشەدەکات.

باش دەزانین ئەو پۆلە خەڵکەی دەتوانن گەلێك کار ئەنجام بدەن چەند شادمان و خۆشبەختر دەژین، ئەوانە کەسانێکن هەموو شتێك لە پاوانی دەسەڵاتیان دایە. لە هیچ بارودۆخ و کاتێکدا دەستە پاچەنابن، شتومەك لە ژێر فەرمانیان دایە و حوکمی بەسەردا دەکەن، بە پێچەوانەشەوە کەسانێك هەن هەمیشە سەرنجی بەزەیمان

بۆ لای خۆیان رادەکێشن ئەوانە لە ئاست هەر کارێکی چکۆڵە و هیچ، دادەمێنن، هەست ناتوانن خزمەتی خۆشیان بکەن، هەمیشە چاو لە دەستی، مشوور، ئاگاداری و یارمەتی خەڵکی دیکەن، خۆ ئەگەر کەسێك دەستی یارمەتیان بۆ درێژنەکات ئەوا لە دۆخێکی خراپدا دەژین سەر لێشواو و دەست و پێ سپی.

دیارە لە سنووری خێزانێکدا ئاسان نییە منداڵ لە تەك کار و کۆششیدا بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەروەردە بکرێت کارەکەی پێی بگوترێ پیشەی تایبەت. بۆ دەستەبەرکردنی کاری تایبەتمەند و پیشەی چاك چوارچێوەی خێزان یارمەتی دەرنییە.

منداڵی کچ یا کوڕ پیشەی تایبەتمەند لە سیستم و پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی دەستەبەر دەکەن، وەك قوتابخانە، کارگە، دامەزراوە، یا رکابەرێ. وەلێ دایك و باوك نابێ وا بیربکەنەوە پەروەردەی خێزانی هیچ پەیوەندییەکی بەوەدەستهێنانی پیشەییەکی تایبەتەوە نییە. ئامادەیی بۆ ئەنجامدانی کاری خێزان بایەخێکی مەزنی هەیە لە پیشەی داهاتووی منداڵدا. ئەگەر منداڵێك لە سنووری ماڵێدا وێڕای پەروەردەکردن فێری کار و کۆشش بوو ئەوا لە داهاتوودا سەرکەوتوانە دەتوانێ قۆناغی خۆ ئامادەکردن بۆ پیشەییەکی تایبەت ببڕێ. ئەو منداڵانەی هیچ جۆرە ئەزموونێکیان لە کار و رەنجی خانەوادەدا نییە نابنە خاوەن پیشە و لەگەڵ شکستگەلی جۆرا و جۆر دەستە و یەخەدەبن.

بۆ ئەم مەبەستە پێویستە ئەرکگەلی ئەوتۆ بخرێتە ئەستۆی منداڵ کە بتوانێ بە سوود وەرگرتن لە ئامرازی ئیش کردن بەجێیان بگەیەنێ. ئەمەش نابێ کاتێکی کەم بخایەنێ دەشێ بە ئەنجامگەیاندنیان بگاتە چەند مانگێك یا ساڵ. لێرەدا گرینگ ئەوەیە منداڵ ئازادی کار و هەڵبژاردنی ئامێرەکانی هەبێت. ئەم جۆرە کارەش پێویستە لایەنی بەرپرسی لە ئەنجامدانی کار وەخۆبگرێت.



بۆ نموونە دەکرێ ماوەیەکی دووردرێژ خاوێنکردنەوەی ژووری دانیشتن بخرێتە ئەستۆی منداڵ، ئیدی ئەو چۆن بەو کارە هەڵدەستێ جێبەجێی دەکات با بە ئارەزووی خۆی بێت، لێگەرێ با خۆی رێگەیەك بدۆزێتەوە. یەکەم هەنگاو تەنیا کارێکی جەستەی، دووەم هەنگاو ئەرکێکی سیستماتێکت پێ سپارد، دووەمیان گەلێك گرینگترە، بەم پێیە تاچ ئەندازەیەك ئەرکی ئەنجامدانی کار ئاڵۆزتر و سەربەخۆتر بێ بەو ئەندازەش دەرئەنجامی پەروەردەکردن چاکتر دەبێ.

زۆر لە دایکان و باوکان ئەم بارودۆخە لەبەرچاو ناگرن، چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەم یا ئەو کارەی فێر دەکەن بەڵام ناچنە ناو وردەکاریەکانی. بۆ نموونە منداڵەکەیان بۆ کڕینی شمەك دەنێرنە دوکانێك، باشتروایە ئەرکێکی دیاریکراو هەمیشەیی بێ بسپێردرێت وەك ئەوەیە: هەمیشە کڕینی صابوون و خەمیرددان لە ئەستۆی ئەو دابێت، ئەم کارە لایەنی سیستماتێکی هەیە و هەستی داهێنانی بە هێزدەکات. بەشداریکردنی منداڵان لە کار و کۆششی خێزان پێویستە زۆر زوو لە یاری کردنەوە دەستی بکات. بزانێ کە بەرپرسی ئامرازەکانی گەمە کردنی نییە بەڵکو بەرپرسی خاوێنی و رێك و پێکی جێگا کەشیانە.

کاتێك منداڵە لە قوتابخانەی سەرەتایی دەخوێنێ بە ئەندازەیی تەواو مەشق و نووسینەوەی بۆ دیاری دەکرێت. ئاساییە کە ئەم ئەرکانە لە پێش هەموو شتێکەوەن، وەلێ دەبێ بزانێ ئەوە تەنیا کاری شەحصی خۆیان نییە بەڵکو ئەنجامدانی کارێکی کۆمەڵایەتیشە. لە کاری قوتابخانەدا نەك هەر لە بەرامبەر دایك و باوکیان بەرپرسن بەڵکو دەبێ لە ئاست پەروەرکارە کانیشان هەست بە لێپرسێنەوە بکەن. لە لایەکی دیکەوە ئەوە راست نییە تەنیا کاری قوتابخانە جێگای رێز بێت و کارەکانی تر پشت گوێ بخرێت. بقوم بوون لە کار و مەشقی قوتابخانەدا گەلێك مەترسیدارە، چونکە بێزاری و دوورکەوتنەوەی تەواو لە ژیان و کاری کۆمەڵایەتی خێزان لە دەروونی منداڵدا دەخولقێنێ. هەمیشە پێویستە

فەزایەکی لە بار بۆ هاوکاری لەئارا دابێ. رەنگە زۆر جار هەستی یارمەتی دانی یەکێك بۆ یەکێکی تر پتر ببزوێ، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش بە چ رێبازێك دەتوانین و دەبێ هەوڵی کار و کۆششی لە منداڵدا وەدیبێنین. رەنگە رێبازگەلی جۆرا و جۆر هەبێت.

زۆر جار رووەدا لەبەر بێ ئەزموونی و لاوازی هێزی دەرککردن، منداڵ ناتوانێ سەربەخۆ ئەم یا ئەو کارە ئەنجام بدات. لەم حاڵەتانەدا دەبێ دایك و باوك بە پارێزەوە پێی بڵێن و یارمەتی بدەن تا پەیوەندی خۆیان لەگەڵ ئەو مەشق ئەرکە روونبکەنەوە ئینجا بۆ ئەنجامدانی هاوکاری بن.

باشترە بۆ ئەو مەبەستە هەستی منداڵ لەمەڕ لایەنە هونەریەکەی بوروژێنرێ، وەلێ نابێ خراپ کەڵکی لێوەربگیرێ. پێویستە منداڵ بتوانێ ئەو جۆرەکارانەش ئەنجامبدات کە حەزی لێیان نییە و هەر لە سەرەتاوە لێیان بێزارە. بە گشتی دەبێ منداڵ وا پەروەردەبکرێ کە هەوڵ و تەقەلای بۆ ئەنجامدانی کار تەنیا وەك ئەرك نییە، بەڵکو لەبەر پێداویستی و سوودمەندییەتی، ئەوەندە شایستەی کارکردن بێت بەبێ منجەبخ بە سەبر و لە سەرەخۆیی هەر کارێکی نا بەدڵیش ئەنجامبدات. دوایی نالە بارترین کار خۆشحاڵی دەکات، بەو مەرجەی بەهای کۆمەڵایەتی ئەو کارەی بە تەواوی لا روون بێت. ئەمەش پتر پەیوەندە لەگەڵ گەشەکردنی منداڵ.

لە هەندێك حاڵەتدا ئەگەر حەز و پێویستی تەواو بۆ بزاوتنی ئارەزووی منداڵ لە ئاردا نەبوو، دەکرێ رەوشی داوایەکە بگوردرێ. ئەم داوا گۆڕییە لەو رووەوە لەگەڵ میتۆدەکانی دیکە جیاوازە کە دەبێ منداڵ لە هەڵبژاردندا تەواو ئازادبێ. ئەم تکاو داوایە دەبێ بە جۆرێکی ئەوتۆ ئەدا بکرێت منداڵ وابزانێ تەنیا بە خۆشی خۆی کارەکە ئەنجام دەدات و هیچ جۆرە زۆرێك لە کاردا نییە، بۆ نموونە دەبێ بڵێین:



تکایەکم لێتە هەرچەند دەزانم کارێکی سەختە و خۆشت کارت زۆرە .... ئابەم شێوەیە... تکاو داواکردن باشترین و نەرمترین رێبازە بەڵام نابێ خراپ کەڵکی لێوەر بگیرێ. باشتروایە هەمیشە لەو کاتانەدا بەکاربێ کە دڵنیابن منداڵەکە بە پێخۆشبوونی خۆی تکاو قسەتان دەگرێتەوە. ئەگەر دوو دڵبوون داوایەکەتان بگۆڕن، لە سەرەخۆ و دڵنیا ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بتوانن ناوبەناو بە تکاو داوا هێندێك کار بە منداڵەکەتان بسپێرن، بە تایبەتی ئەگەر هەستی غەریزە شەخصی ببزێون فێردەبێ کە ناچارە، ئەوسا بە ویستی خۆی کارەکە ئەنجامدەدات و داوا کاریەکانتات نەدوا دەکەون نە دەوەستن.

یەکێك لە گرفتەکانی دایك و باوك ئەوەیە چۆن مامەڵە لەگەڵ منداڵە تەمبەڵەکەیان بکەن. لێرەدا دەبێ بڵێین تەمبەڵی هەستی بێزار بوونە لە کار، تەنیا لە هێندێك حاڵەتی دەگمەندا نەبێ دەنا لە ژێر هۆکاری نەخۆشی. لاوازی جەستە و روحی سەرکێشی سەرهەڵدەدا ئەو باشترە ببرێتە لای پزیشك.

گەلێك جاران تەمبەڵی لە پەروەردەکردنی رێك و پێکی منداڵەوە دێت. کاتێك سەرتایەتی دایك و باوك فێری ناکەن چۆن کەڵك لە هێزی خۆی وەربگرێ و بەسەر گرفتەکاندا زاڵ بێت، هەستی خۆشەویستی کار و پیشەی تێدا ناخولقێنن. لەبەر ئەوە خودی کارکردن و گەیشتنە ئەو شادییەی لە ئەنجامی کاردا سەرهەڵدەدا. لە منداڵەکەدا پەروەردە نەبووە.

منداڵانێك هەنە ئامادەی ئەنجامدانی هەر جۆرە کارێکن وەلێ بەبێ هۆگری، ویستی دەروونی و بیرکردنەوە و خۆشحاڵبوون. بۆیەش ئەم کارە دەکەن تا لە سەرزەنشت و شتی ئاوا بە دووربن. ئەم جۆرە کارکردنەی کاری قوورسی ئەسپ مان دێنێتەوە یاد. ئەم جۆرە کەسانە بە تەواوی کۆنترۆڵی کاری خۆیان لە دەست دەدەن و بە چاوی رەخنەوە ناتوانن لە کارەکانیان بڕوانن. ئەنجۆرە کەسانە چەوساوەی باشیان

لێ باردێت کە بە درێژایی تەمەنیان خەمی ئەوەیانە چۆن خزمەت بکەن، کۆمەك بکەن هەتتا بەو کەسانەی خۆیان توانای کاریان نییە.

بە راستی منداڵ نابێ ئاوا گوێڕایەڵ وەك کەری بار پەروەردەبکرێ، چونکە ئەمجۆرە کەسانە هیچ جۆرە ویستێکی ئەخلاقییان لەسەر کاری خۆیان و خەڵکی تردا تێدانابێ. لەم رووەوە پێویستە دایك و باوك ئاگاداربن برا گەورە نەتوانی کەڵك لە کۆشش و رەنجی برا بچووکی وەربگرێت، ئاگاداری هەستی هاوکاری دوو لایەنەبن تا لە بواری کاردا هیچ جۆرە نابەرامبەریەك نەیەتەدی.

## پەروەردەی سێکسی

پرسی پەروەردەی سێکسی یەکێکە لە دژوارترین پرسەکانی پەروەردەکردن، لە راستیدا لەمەڕ هیچ پرسێکدا بەم ئەندازەیە بیر و رای نابەجێ و سەیر و سەمەرە نەبووە. وەلێ لە هەمانکاتدا لە رووی کردەوە زۆر سەخت نییە، لەگەڵێك خێزاندا زۆر سادە و بێ دوو دڵی و دڵەراوکێ جێبەجێدەکرێ. ئەم پرسە ئەو کاتە قورس دێتە بەرچاو کە یەکلایەنە تاوتوێ بکرێ یا لە رادەبەردەر بایەخی پێبدرێ و لە پرسەکانی تری پەروەردەکردن جوێبکرێتەوە.

ژیانی سیکسی مرۆڤ دەبێ بەشێوەیەکی تەواو لە ژیانی سیکسێ ئاژەڵ جیابکرێتەوە دەرخستنی ئەم جیاوازیەیە ئامانجی پەروەردەی سیکسی بە شاراوەیی دەهێڵێتەوە، ئاژەڵ تا ئەو سنوورە پێویستی بە ژیانی سێکسی هەیە بتوانێ وەچەیەك لە دوای خۆی بەجێبهێڵێ بەڵام ئادەمیزاد لەتەك ئەم ئامانجەش جگە لە ئارەزووی منداڵبوون هەوڵدەدا تام و چێژی خۆی دابین بکا. هەر ئەم هەوڵ و



کۆششە زۆر جاران شێوەگەلی هەڵە و نابەجێی ئەوتۆ وەخۆدەگرێت کە نە تەنیا دەبێتە مایەی بەدبەختی خود بەڵکو دەبێتە هۆی بەدبەختی خەڵکی تریش.

پێویستە دایك و باوك منداڵەکانیان باش پەروەردە بکەن کەسایەتێکی لێبارببێنن کە لە رەفتار و کردەی خۆیدا بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی لەبەرچاو بگرێت و کاری چەواشە ئەنجام نەدات. ئاکاری کۆمەڵایەتی لەمەڕ ژیانی سێکسی چ شتێکی گەرەکە؟

ژیانی سێکسی هەر ژن و پیاوێك واپێویست دەکات هاماهەنگی دوو لایەنەی ژیان وەخۆ بگرێت چ خێزانی چ خۆشەویستی. ئەم ئاکارانە تەنیا ئەو ژیانە سێکسییە بە سروشتی و راست دەزانن کە لەسەر بنەمای ئەوین و خۆشەویستی دامەزرابن و لەناو خێزاندا بوونی هەبێ، واتە لە پەیوەندی ژن و مێردا رەنگ بداتەوە. ئەو پەیوەندییەی دوو مەبەستی هەیە یەکیان بە ختەوەری ئادەمیزادە دووەمیان وەدنیاهێنان و پەروەردەکردنی منداڵە. کاتێك لە بارەی هەستە سێکسییەکانی داهاتووی پەروەردەکردنی منداڵەکەمان دەدوێین دەبێ لە ئەوێنی ئایندە لە پێگەیاندنی ئەو منداڵە بۆ ئەندامی خێزانێکی دوارۆژ بدوێین، هەر جۆرە پەروەردەکردنێکی دیکەی سێکسی بە پێچەوانە و بە زیانی کۆمەڵ دەبێ. ئامانجی هەر دایك و باوکێك دەبێ ئەوە بێت هاوڵاتیەك پەروەردەبکات خۆشبەختی خۆی لە خۆشەویستی خانەوادەدا بدۆزێتەوە، تەنیا لەم شێوەیەی ژیاندا دەکرێ شادمانی ژیانی سێکسی دەستەبەر بکرێ. ئەگەر دایك و باوك ئەوە ئامانجیان نەبێت ئەگەر لە گەیشتن بەو ئامانجە سەرکەوتوونەبن ژیانی سێکسی منداڵەکەیان تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت و سەرتاپای ژیانیان ناواخن دەبێ لەگەڵێك داستانی دراماتیکی و بەدبەختی و زەرەر و زیانی کۆمەڵایەتی.

ئاشكرایە لە پرسەكانی پەیوەندی دار لەگەڵ پەروەردەكردنی سێكسی تەنیا ئەو ئامرازانەی جیان و بۆ پەروەردەكردنی سێكس لەبەرچاو گیراون ناتوانن فاكتەری سەرەكی بن، بەڵكو گشتگیری و كامڵی پرۆسەی پەروەردەكردن فاكتەری ئەم بابەتەن.

راستە منداڵ زۆر جار دەپرسێت منداڵ لە كوێوە دێت بەڵام لەم پرسیارەوە نابێ بگەینە ئەو دەرئەنجامەی كە منداڵ لە سەرەتایی تەمەنیدا هەموو شتێك بزانێ و لە نووكەوە هەرچی هەیە بۆی روونبكرێتەوە. تەنیا لە پرسە سێكسییەكاندا نییە كە منداڵ هێندێك شت نازانی. پرسگەلێكی دیكەش هەن لای شاراوەن، ئێمە نامانەوێ ئەو زانیاریانەی دەرخوارد بدەین كە لە وزە و توانای ئەو بەدەرە.

بۆ نموونە بۆ منداڵێكی سێ ساڵە روون ناكەینەوە گەرما لە كوێوەدێ و سەرما لە كوێوە؟. بۆچی رۆژ كورت دەبن و درێژ دەبنەوە، هەر بەم شێوەیە هەر چەندە لە حەوت ساڵیدا چۆنیەتی دروستكردنی مۆتۆری فرۆكەی فێرناكەین!

هەر زانیارییەك كاتی دیاریكراوی خۆی هەیە. هیچ شتێك لەوە مەترسیدارتر نییە وەڵامی هەر پرسیارێكی منداڵ بدەینەوە بڵێین: تۆ هێشتا منداڵی ئەگەر گەورە بووی ئەوسا دەزانی.

ئەوەتان لە بیر بێ لەمەڕ پرسی سێكسی هیچ ئارەزوویەكی مكوڕ و تایبەت لە دەروونی منداڵدا نییە، ناگونجێ بشبێ، چونكە ئەم ئارەزووە تەنیا لەگەڵ كامڵبوونی سێكس (واتە خۆناسین/ وەرگێر) سەرهەڵدەدا، تاو ئەو كاتەش هیچ نهێنیەك لە ژیانی سێكسدا بۆ منداڵ نامێنێتەوە.

بەم پێیە كاتێكی دیاریكراوە نییە تا پەلەی لێبكرێ و نهێنییەكانی لە دایكبوون بۆ منداڵ روون بكرێتەوە، بۆ ئەمەش پرسیاری بە رێكەوتی منداڵ بكرێتە بەهانە، ئەم جۆرە پرسیارانە هیچ جۆرە هەستێكی تایبەتی سێكسیان تێدانییە. مانەوەی ئەم رازە نابێتە هۆی هیچ جۆرە رەنج و ئازارێكی منداڵ. ئەگەر لە راست ئەم پرسیارە



بە تاكتیكێكی تایبەت خۆ لە وەڵامدانەوەی ببوێرن و بیكەیە خەندە و گاڵتە و گەپ ئەوا منداڵەكە زوو پرسیارەكەی لە بیر دەچێتەوە و بە شتێكی دیكەوە سەرگەم دەبێ. بەڵام ئەگەر لە راست ئەو پرسیارەی منداڵێكی كەم تەمەن هەرچی رازو وردەكارییەكانی ژن مێردایەتی هەیە روونی بكەینەوە ئەوا هەستی لێكۆڵینەوە سەبارەت بە پرسەكانی سێكس دەورۆژێنی: ئەوسا لە زۆر زووتر پێش ئەوەی وەختی خۆی بێت دەبینی هەستی سێكسی منداڵەكەت وەئاگاهێناوە. چونكە ئەو زانیاریانەی بۆی روونكەینەوە هیچ پێویستی پێیان نییە و بێ سوودن. بەڵام ئەو بیر و خەیاڵەی ئێوە بە روونكردنەوەكانتان لە مێشكی رۆدەكەن دوور نییە ئەو هەستەی سێكسەی بوروژێنێ كە هێشتا كاتی خۆی نەهاتووە.

شاردنەوەی ئەو رازانە لە كاتی ئاوادا جێگای مەترسی نین. منداڵ دەبێ بزانێ لە زۆربەی لایەنەكانی ژیاندا باس و خواسی نهێنی و داپۆشراوی دۆستانە و خۆمانە هەیە، كە ناكرێ بە هەموو كەسی بگوترێ و بخرێتە بەرچاوی سەرتاسەری كۆمەڵ. تەنیا ئەو كاتانەی منداڵ لەمەڕ ژیانی دۆستانەی مرۆیی پەروەردەبووە خووی گرتووە ژیرانە لە هێندێك پرس سەردەربێنێ، دوای ئەوەی لە كەم تەمەنی تێپەڕبوو دەكرێ لە بارەی ژیانی سێكسییەوە لەگەڵی بدوێن، ئەم گفتوگۆیەش دەبێ بەنهێنی لە نێوان باوك و كوڕ یا دایك و كچدا ئەنجام بدرێ. ئەمەش ئیتر سوودی راستەوخۆی دەبێ چونكە لەگەڵ هەستی سروشتی سێكسی كوڕ یا كچ یەكدەگرێتەوە. ئنجا مشتومڕ لەسەر بابەتە سێكسییەكان هیچ زیانێك ناگەیەنێ. هەم دایك و باوك هەم منداڵ گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی تێبگەن لەبارەی بابەتێكی گرینگی ژیانەوە دەدوێن. تێدەگەن گەیشتنە ئاكام لەم باسەدا و بڕیاردان لەسەر ئەم بابەتە لە هەر روویەكەوە بۆیان بە كەڵكە. ئەم گفتوگۆیە پێویستە لەسەر تەندروستی سێكسی و لە هەمانكاتدا لەسەر ئاكارەكانی بێت. لە قۆناغی خۆناسین یافامكردنەوەدا پێویستن وەلێ نابێ، بێ هۆ لە ئەندازە تێپەڕێ و زیاد لە

پێویست بایەخی پێبدرێ. لە راستیدا واپێویست دەکات ئەم باس و خواسە لە گەڵ پزیشکدا بێت یا سەرپەرشتیاری قوتابخانەی یا دامەزراوەکانی تر بیخنە ئەستۆ. دەکرێ بەم وتانە پەیوەندی سێکسی نێوان ژن و پیاو و خۆشەویستی روونبکرێتەوە، بمانەوێ یا نەمانەوێ ئەم گفتوگۆیانە دانوسانی ناسکی سێکسن. کاتێك لە تەمەنی باڵاتر لە بارەی ژیانی سێکسییەوە دەدوێن، دەکرێ بە ئەوین و خۆشەویستییەوە ببەسترێتەوە و رێزێکی قووڵ بۆ ئەم پرسە و پرسە مرۆییەکانی تر دابندرێ. بەشێوەیەکی بەرچاو لە ئەدەبیات و ئەزموونی خەڵکی دەوروبەر لە رێگەی دیکەی کۆمەڵایەتییەوە لاوانی کچ و کوڕ لەگەڵ بابەتەکانی ئیشق و ئەوین شارەزادەبن. لەبەر ئەوە پێویستە دایك و باوك جەخت لەسەر ئەم زانیاریانە و بیر و بۆچوونی لاوەکانیان بکەن.

پەروەردەی سێکسی دەبێ پەیوەندی تایبەتی بە ئەوینەوە هەبێت واتە هەستێکی بەرزو قووڵ کە تاکە رواڵەتی شۆخ و شەنگی ژیانە و تاکە هەوڵ و ئارەزووی هەر تاکێکی مرۆوە.

ئەم جۆرە پەروەردەکردنە پێویستە بێ روونبکرێتەوە و وردەکاری زیاد دوور لە دەرخستنی بابەتەکانی ئەندامی لەش بێ.

پەروەردەکردنی ئارای سێکس چۆن ئەنجام دەدرێ؟

ئەوینی راستەقینەی نێوان دایك و باوك، رێزگرتنی یەکتری، یارمەتی و خەمخۆری، بە تەنگ یەکەوە بوون، دڵسۆزی و لاواندنەوەی یەکتر، هەر لە ساڵەکانی سەرەتایی ژیانی منداڵ کە ئەمانە بە چاوی خۆی دەبینێ، دەبنە بە هێزترین فاکتەر بۆ راکێشانی سۆز و خۆشەویستی منداڵ و هۆگربوونی ئەم پەیوەندییە تۆکمە و شەنگەی نێوان ژن و مێرد.



دووەمین فاکتەری گرینگ بزاوتن و بارهێنانی خۆشەویستی منداڵە، ئەگەر وا پەروەردەبکرێ دایك و باوك و خوشك و براکانی خۆشبوێ، دڵی بە فێرگە و نیشتمانەکەی خۆشبوێت ئەوا مەبەستی پەروەردەکردن خەملێوە. وەلێ ئەگەر خۆپەسندی پایەکانی ئاکاری منداڵ دابرێژێ ئەوا ئەستەمە بتوانێ ئەو ژنەی خۆشبوێت کە هەڵیدەبژێرێ. ئەم جۆرە کەسانە هەستێکی سێکسی توند و تیژیان هەیە، وەلێ رێز بۆ ئەو ژنەی خۆشەویستیانە دانانێن. هیچ بەهایەك بۆ ژیانی رۆحی لەبەرچاو ناگرن، کارێکی واناکەن سەرنجیشی بۆ لای خۆیان رابکێشن. ئەمجۆرە خەڵکانە رەوشتیان نزمە بە ئاسانی خۆشەویستی خۆیان دەگۆڕن، دیارە ئەمە هەر لەبارەی پیاوانەوە نییە بەڵکو لەمەڕ ئافرەتانیش هەر راستە.

ئەوینی ناسێکسی واتە ئەو خۆشەویستییەی کە هەر لە منداڵییەوە سەرهەڵدەدا بە دڵداچوونی کەسانی تایبەت، خۆشەویستی منداڵ کە ئەویش هەر لە سەرەتاوە پەرەدەستێنێ. ئەمانە هەموویان باشترین شێوازان بۆ پێگەیاندنی پەیوەندی بەرزی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئافرەتێك کە دەکەوێتە بەر دڵ.

بێ گومان منداڵ دەبێ دۆست و ئاوەڵی هەبێ، ئەویش نەك سەرپێی و لە رووی خۆپەسندیەوە بەڵکو پێویستە بەرژەوەندی ئەوانیش لەبەرچاو بگرێ، دەبێ تا ئەو ئەندازەیەی دەکرێ شارو جێگەی کاری باوکی خۆشبوێت، هۆگری زێد و مێژووەکەی، هۆگری پیاوانی هەڵکەوتووی وڵاتەکەی بێ، بۆ ئەم مەبەستەش تەنیا وتوویژ بەس نییە.

دەبێ منداڵ زۆر شت ببینێ و بیر لە گەلێك شت بکاتەوە، پێوستە هەستی هونەری هەبێت، ئەدەبیاتی هونەری، سینەما، شانۆ فاکتەرگەلێی چاکن بۆ هەوێنکردنی ئەم هەستە، ئەم پەروەردەکردنەش هەمان بارهێنانی پەیوەندییە سێکسییەکانە، تایبەتمەندی کەسایەتی ئەو خەسڵەتانە وەدێدێنێ کە لە مرۆڤێکی

کۆمەڵایەتیدا هەن. ئەم مرۆڤە لە پەیوەندیە سێکسیەکانی خۆیدا بە پێی ئەم خەسڵەتانە دەجووڵێتەوە.

شێوازی ڕاست و دروست بایەخێکی دیکەشی هەیە. کردەوەی پێچەوانەی ژیانی سێکسی زۆرتر بە ڕێکەوت یا لە دیداری بێ نەزمی کچ و کوڕدا، لە بیکاری و کات بەسەربردن، بێ کۆنترۆڵ بێ ئامانج دەبێ، پێویستە دایك و باوك بزانن ڕۆڵەکانیان لەگەڵ کێ پەیوەندیان هەیە، نیاز و مەبەست لەم پەیوەندییە چییە؟

لە ئاکامدا شێوازی ڕاست دەبێتە هۆی ئاوێتەبوونی ڕێك و پێکی هەستی جیهانی، ئەو هەستەی هەرگیز هۆکاری سێکسی زوو بەخەبەر ناهێنێ.

کاتی ڕاکشان بۆ خەوتن، کاتی لە خەو هەستان، نابێ ڕێگە بدرێ منداڵ بەبێ هۆ لەناو پێخەفەکەیدا بمێنێتەوە، ئەم خوگرتنە دەرئەنجامی سێکسە. مەرجێکی تری گرینگ بۆ پەروەردەکردنی سێکسی بریتییە لە سەر قاڵکردنی منداڵ بە ئیش و کارەوە. ماندووبوونی سروشتی ئێواران زوو هەستانی بەیانیان هەوڵگەلێکی بە کەڵکی بۆ کامڵ بوونی هێزی لەش و لاری ئادەمیزاد و بۆ دابەشکردنی هاوسەنگی هێزی منداڵ بە درێژایی ڕۆژ.

لە هەل و مەرجێکدا ئاوادا ویستی گیان و جەستە بۆ کاری بێهوودە سەرف ناکرێ و نابنە گەرۆکی و تەمبەڵی، بوارنادا هێزی خەیاڵ و وێناندنی دیدار و هەستە سەر پێیەکان بوروژێن.

وەرزشیش بایەخێکی باشی هەیە بۆ پەروەردەکردنی گشتی. بێگومان ڕەنگدانەوەی لەسەر سێکسیش هەیە. ڕاهێنانی وەرزشی بە بەرنامەی باش بە تایبەتی خلیسکە، سواری، بەلەم سواری. وەرزشی لەش و لار گەلێك بەکەڵکن.



کاتێك ئەم هەل و مەرج و میتۆدانە بەکاربرێت، ڕاوێژی ڕاستەوخۆی دایك و باوك لە ڕێگەی وتوویژ ئەویش ئەگەر بە ڕێکەوت بێ باشترە، پرۆسەکە ئاسانتر و دەرئەنجامەکەی باشتر دەکەن.

ئەگەر ئەم مەرجانەی سەرەوە لەبەرچاو نەگیرێن هەستی منداڵ لەمەڕ تاکتاکی خەڵك و لەمەڕ کۆمەڵگا پەروەردەنەکرێ، یا ژیانێکی پڕ لە نەزم وەرزش بۆ منداڵ نەرەخسێنرێ هیچ جۆرە وتوویژ و دانوسانێك هەتتا ئەگەر ژیرانە و بەجێش بی سوودبەخش نابێ.

راهێنان لەسەر ڕێوڕەسمی شارستانیەت

تیکڕای ئەو دایك و باوکانە پێیان وایە پەروەردەکردنی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرشانی فێرگە و کۆمەڵگا، خانەوادە لەم بوارەدا هیچی لە دەست نایا، بە هەڵەداچوون. گەلێك خانەوادە بە خوراك، جل و بەرگ و گەمە کردنی منداڵەکانیان باشڕادەگەن. دڵنیان لە تەمەنی قوتابخانەی سەرەتایی پێویستە بگەڕێ و ساغڵەمی بەدەست بێنێ، هەر لەوێشدا لەگەڵ کار و باری کۆمەڵایەتی شارستانیەت شارەزادەبێت.

لە ڕاستیدا خانەوادە نە تەنها ئەرکی سەرشانیەتی هەرچی زووتر ئەم پەروەردەکردنە کۆمەڵایەتییە دەستپێبکا، بەڵکو گەلێك توانای بۆ ئەم مەبەستە لە دەستدایە، کە پێویستە تائەو سنوورەی دەکرێ بەشێوەی باشتر کەڵکیان لێوەربگرێ.

ئەو خێزانەی دایك و باوکەکەی چالاکی کۆمەڵایەتیان هەیە، کتێب و ڕۆژنامە یەکێکە لە بنەما پێویستەکانی، لەوێدا پرسەکانی پەیوەندیدار لەگەڵ شانۆ و سینەما بۆ هەمووان زیندوویە، پەروەردەی کۆمەڵایەتی لۆکاڵێکی سەرەکی هەیە، هەتتا ئەگەر بە بیری دایك و باوکیش دانەیەت. ئەوەش بەو مانایە نییە کە ئاکارەکانی پەیوەست لەگەڵ پەروەردەی کۆمەڵایەتی لە خۆیانەوە بەو شێوەیە

گەشەدەکەن، چونکە دەسبەردان لەو ئەرکە وەك هەرکارێکی دیکە زەرەر و زیانی لێدەکەوێتەوە و ئاستی ئاکارەکانی پێگەیاندن دێنێتە خوارێ و گەلێك هەڵە و بولێڵ دەخولقێنێ.

گێڕانەوەی لە باری داستانێك خۆی سەرەتایی پەروەردەکردنێکی کۆمەڵایەتییە، زۆرباش دەبوو کتێبخانەی هەر ماڵێك کۆمەڵێك داستانی منداڵانی تێداهەبا.

لە گێڕانەوەی داستان بۆ منداڵی کەم تەمەن پێویستە زمانی داستانە بگۆردرێ و کورتبکرێتەوە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ بگوترێ منداڵ تێیبگا. رەنگە دایك و باوك ئەو داستانانە بزانن کە لە سەردەمی لاوێیتدا گوێبیستی بوون، هەڵبژاردنی ئەو داستانانە بایەخێکی مەزنی هەیە، پێش هەموو شتێك ئەو داستانانەی هێزی ئەهریمەن، شەیتانی، جادوگەری و دیوودرنجیان تێدایە دەبێ توڕبدرێن. لە تەمەنی بالاَ ئەو کاتەی منداڵ بەسەر قۆناغی تاریکی خەون و خەیاڵی پێشوودا زاڵبووە، دەکرێ ئەم داستانانە بگڕدرێتەوە، ئەمەش رێگەیان بۆ خۆشدەکات بە خەیاڵگەلی هونەرمەندانە هێزە دڕندەکانی دژ بە ئادەمیزاد لە ژێر پەردەی دێوودرنجدا بە دیبکەن. وەلێ لە تەمەنی کەمدا دوور نییە ئەم پاڵەوانە خەیاڵییە دزێوانە ببنە کەسایەتی واقیعی جێگا پەسندی منداڵ، هێزی وێناندن بەرەو بۆلێڵ و تاریکی ببات.

ئێمە پێشنیار دەکەین دایکان و باوکان لایەنی پارێز لەبەرچاو بگرن، نابێ ئەم داستانانە بگێڕدرێنەوە کە بێزاری، لەناوچوونی ئادەمیزاد ئابووری منداڵی تیاباسدەکرێ.

بە گشتی ئەو داستانانە باشن کە پشت بە خۆبەستن، روانگەی پۆزەتیڤ لە بەرامبەر ژیان، ئیمان بە سەرکەوتنیان تێدایە. خۆشەویستی بۆ خەڵکی زەحمەتکێشی کۆمەڵ نابی وێناندنی دیلی، بێ هیوایی و بێ باوەڕی بەدواوە بێ،



دیمەنی جۆرا و جۆری زۆرداری بە دوور لە مرۆڤایەتی دەبێ ساڵانی دواتر بە منداڵ نیشانبدرێ.

چرکەساتی گرینگ لە پڕۆسەی پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی ئەو کاتەیە کە فێری ئەلف و بێ دەبێ. دیارە ئەوەش ئەو کاتە دەستپێدەکا کە منداڵ دەنێتە دەبێتە کۆمەڵگایەکی تر واتە قوتابخانەی سەرەتایی. ئەو کاتەی دەچێتە نێو دنیایی کتێب و وشەی چاپکراو بایەخێکی مەزنی هەیە لە ژیانی منداڵدا، واهەیە منداڵ تابەسەر دژواری گرفتە تکنیکیەکاندا زاڵدەبێت ئەو هەنگاوە بەبێ مەیلی هەڵدێنێ. ئەو گرفتانەش پیتەکان و بواری خوێندنەوە دەیخەنە بەردەمی. لێرەدا نابێ گوشاری بخرێتەسەر، ناشێی رێگە بۆ ئەو تەمبەڵیە خۆشبکرێ کە لە ئەنجامی کێشە لەگەڵ گرفتەکان وەدیدێت.

پێویستە کتێبگەلی فێرکردن و شیاوی تێگەیشتن بۆ منداڵان هەڵبژێرن کە بە خەتی گەورە نووسرابێ و پڕبن لە وێنەی جۆرا و جۆر. خۆ ئەگەر نەشتوانێ بیانخوێنێتەوە ئارەزووی خوێندن و سەرکەوتن بەسەر گرفتەکان لە دەروونیدا دروست دەبێت. لەگەڵ فێربوونی ئەلف و بێ قۆناغی دووەمی بواری پەروەردەکردنی منداڵ دەسپێدەکا ئەو قۆناغەش فێربوون و وەرگرتنی زانیارییە. لێرەدا قوتابخانەی رۆڵی سەرەکی هەیە. وەلێ بەو مانایە نییە دایك و باوك ئەرکی سەرشانیان فەرامۆشبکەن و بیخەنە ئەستۆی قوتابخانە. بارهێنانی کۆمەڵایەتی منداڵ لە ماڵی بەیایەخێکی بەرچاوی هەیە بۆ حاملاندن و رێنوێنی کردن، بۆ چۆنیەتی بە کارهێنانی توانایەکانی بۆ پێکهێنانی پەیوەندی راست و لەبار لەگەڵ مامۆستا و قوتابی و دامەزراوەکانی قوتابخانە. هەر لەو کاتەدا رۆژنامە و کتێب، شانۆ، سینەما، مۆزەخانە، پێشانگا و ئامرازەکانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی بایەخی زۆریان هەیە.

## ڕۆژنامە

ئەو کاتەی منداڵ هێشتا نەخوێندەوارە، تەنیا دەتوانێ گوێبیستی نووسینەکانی بێ، ڕۆژنامە و گۆڤار بەشتێك لە هەست و نەستی داگیر دەکەن.

هەر ڕۆژنامەیەك بابەتێکی ئەوتۆی تێدایە کە دەکرێ بە دەنگی بڵند بخوێنرێتەوە و باسی لەسەر بکرێ، ئەگەر بابەتەکە تایبەت بە منداڵیش نەبێت با لە ئامادەبوونی ئەودا بخوێنرێتەوە. واباشترە لە کاتی خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە منداڵەوە هەیە بە قەد و قیافەیەکی ئەوتۆوە بخوێنرێتەوە کە گوایە لەبەر خاتری ئەو نییە.

هەر چۆنێك بێت ئەو بابەتەی ئێوە دەیخوێننەوە ئەو دەیبسێ، تاخوێندنەوە کە پتر درێژە بکێشێ نواندن و ئەنقەست لە ڕەفتارتاندا کەمتر دەردەکەوێ، دوای ئەوەی منداڵەکە گەشەی کردوو توانی سەربەخۆ ڕۆژنامە بخوێننەوە، ڕۆژنامە پتر و پتر بایەخ لە لای پەیدا دەکا.

پێویستە هەوڵبدرێ کە خودی منداڵ ڕۆژنامە بخوێننەوە و بێتە فاکتەرێکی پێویستی ژیان و هەرچی خوێنرایەوە بابکەوێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە و تاوتۆی بکرێ.

ئەمەش نابێ تەنیا ڕواڵەت بێ بەڵکو واچاکە کاتی تایبەتی بۆ دیاری بکرێ. لە تەمەنی باڵاتر ئیتر دەبێ خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار خوویەکی هەمیشەیی و پێویستیەکی شارستانیەتی بێ.

## کتێب

ئاشنایی لەگەڵ کتێب دەبێ لە ڕێگەی گوێگرتن لە خوێندەوەی کتێبەوە دەستپێ بکا. سەرەتا دایك و باوك بۆی دەخوێننەوە و لە ئایندە خودی منداڵ وە ئەستۆی



دەگرێ. گەلێك بە کەڵکە کتێب لە کۆڕی خانەوەدەدا بخوێنرێتەوە. بەو مەرجەی ویستی هەمووان بێت و بیر و ڕای ئەندامانی خێزانی تێدا ئاڵوگۆڕ بکرێ. تەنیا بە یارمەتی ئەم جۆرە خوێندنەوەی هاوبەشە دەکرێ هەست و سەلیقەی منداڵ لەمەڕ خوێندنەوەی کتێب ڕێنوێنی بکرێ. خو بە خوێندنەوە بگرێ و هەرچی خوێندیەوە بیخاتە بەر ڕختە. جگە لەوە خوێندنەوەی کتێب و گوێگرتنی منداڵ وردە وردە ئارەزووی خوێندنەوەی سەربەخۆی منداڵ دەستەبەر دەکات.

وەلێ دەبێ دایك و باوك بزانن منداڵەکەیان چۆن کتێب دەخوێنێتەوە، دەبێ لەوە بترسن کە فێربێ تەنیا پەرەکانی هەڵداتەوە و بێ ویست ئارەزوو لە ڕووکاری کتێبەکە بڕوانێ. لە کۆتاییدا پێویستە منداڵ فێر بکرێ پارێزگاری کتێب بگات و ئاگای لێبێ.

## سینەما

لەم سەردەمەدا سینەما و فیلمی باش بە هێزترین فاکتەرن نەك تەنیا بۆ پەروەردەکردنی منداڵ بەڵکو بۆ پێ گەیاندنی گەورەکانیش. پێش هەموو شتێك پێویستە دایك و باوك بزانن منداڵ پەیوەندی لەگەڵ سینەما چۆنە. جاری وا دەبینرێ سینەما مانای ڕاستەقینە و ژیانی منداڵ پێکدێنێ، لەو حاڵەتەدا دەکرێ لایەنی بێ مەیلی و هەستڕاکێشی منداڵەکە ببینرێ کە تەنیا چاوی کار دەکا و هەستی هونەری هەر ڕواڵەتە، نەکاردەکاتە سەر کەسایەتی منداڵ و نە بیر و بۆچوونی دەوروژێنێ. ئێمە پێشنیارمان ئەوە ڕێگەنەدەن منداڵ لە مانگێکدا پتر لە دوو جار بچێتە سینەما. ئەویش بۆ دیتنی فیلمی باش و هەر فیلمێکی سینەمایش واباشترە ببێتە جێگای باس و بیر و بۆچوونی خێزان، پێویستە دایك و باوك هەوڵ بدەن منداڵیش بیر و ڕای خۆی لەسەر ئەو فیلمە دەربڕێ کە دیویەتی، بڵێت چی پێخۆشبووە چی پێ خراپبووە، یا چ خاڵێك بۆتە هۆی وروژاندنی هەست و نەستی.

ئەگەر لە و بیر و را دەربڕینە زانیان تەنیا ڕواڵەتی داستانەکە و لایەنی سەرگەرمی شوژەکە و بەسەرهاتی ئەم یا ئەو پاڵەوانە سەرنجی منداڵەکەی ڕاکێشاوە. پێویستە بە یارمەتی چەند پرسیارێك باسەکە بکێشە ناو خاڵە قووڵ و گرینگەکانی ئەو فیلمە. لە هەمانکاتدا پێویستە فیلمی سینەمایی بۆ منداڵەکانیان دەستنیشان بکەن و لەو فیلمانە دوورکەونەوە کە بابەتەکەیان ئاڵۆزە و منداڵ لێیان تێناگا.

هێندێك فیلمیش بابەتگەلێکی ئەوتۆیان تێدایە دەبێتەهۆی کاردانەوەیەکی نابەجێ لە منداڵدا، دیارە لە هەڵبژاردنی هەر فیلمێکدا دەبێ منداڵ لەبەرچاو بگیرێ و زیان بە قوتابخانە و ڕەفتاری نەگەیەنێ. لە هێندێك کاتی نائاسایی چوونە با سینەما رابگیرێ. ئەویش ئەو کاتانەی منداڵ بەد ڕەفتارە یا کار و باری قوتابخانە بە ڕێك و پێکی ئەنجامدانیدا.

هێندێك جاریش وادێتە پێش دیتنی فیلمێکی سینەما باش یارمەتی منداڵ دەدات لە ئاست قوتابخانە و کارەکانی هەڵسوکەوتی باش بێت.

لە بارەی شانۆشەوە بە دەسنیشانی دایك و باوك دەکرێ بە باشی کەڵکی لێوەر بگیرێ. مۆزەخانە و پێشانگاش بەجێ خۆیان فاکتەری باش بۆ ئاشناکردنی منداڵ لەگەڵ فەرهەنگی سەردەمی خۆیان.

## شێوەکانی تری پەروەدەکردنی کۆمەڵایەتی

ئێمە وتوێژمان لەسەر شێوە گرینگەکانی پەروەردەی کۆمەڵایەتی کرد. ئەگەر دایك و باوك بە گشتی کەڵك لە ڕۆژنامە گۆڤار، سینەما و شانۆ، مۆزەخانە وەربگرن. ئەوسا چ لە ڕووی زانیاری چ لە ڕووی پرۆسەی پەروەردەکردن گەلێك شتیان پێشکەش بە منداڵەکانیان کردووە و دەتوانن گەلێك شتی تریشی پێوە بخەنە سەر. شێوەکانی پەروەدەکردنی کۆمەڵایەتی جۆرا و جۆر لەوەی لە یەکەم سەرنجدا



دەردەکەوێ. بۆ نموونە یەکێك لە ڕۆژەکانی پشووی زستانە یا هاوینە لەبەرچاو بگرن و بۆ گەشت و گوزار بچنە دەرەوەی شار. ئاشنایی لەگەڵ سروشت، بەکێو هەڵگەران، هەروەها گەلێك بابەتی مەزنی تر وەك سەر لە نوێ دروست کردنەوەی شار. دروستکردنی ڕێگا و بان و باڵەخانە و شتی تر، هەموو یان بۆ پڕکردنەوەی ڕۆژی پیشوو سەرنج ڕاکێشن، دیارە ئەمەش نابێ وەك وتارێکی تایبەت و گوزارشت بخرێتە ڕوو. گەڕان دەبێ گەڕان بێ و پێش هەموو شتێك پێویستە لایەنی پشوودانی هەبێت وەلێ لە بواری گەشت و گوزار منداڵ بەبێ ویستی خۆی لەو شتانە ورد دەبێتەوە کە دەیانبینێ. لەو کاتەنەدا چەند وشەیەکی ئێوە هەستەکانی بە تینتردەکات. چەند وشەی بەدەم گاڵتەوە یا گێڕانەوەی کورتە بەسەر هاتێك یاداستانێکی پێکەنیناوی کاری خۆی دەکات. هەر چۆنێك بێ پێویستە خانەوادە هانی وەرزشکردن بدات. کارێکی خراپە کوڕەکەتان بە ویست و خۆشەویستەوە سەر بە هەموو یاریگاکانی تۆپانێدا بکات. ژمارەی ڕێکۆردەکانی لە بەربێ کەچی خۆی لە هیچ دامەزراوەیەکی وەرزشی بەشداری نەکات. پێویستە هەر خێزانێك هەوڵبدا منداڵەکەی نەك هەر لایەنگری وەرزش بێ بەڵکو پێویستە وەرزشکاریش بێت. چ لە ڕووی باشتر خودی دایك و باوك بەشداری وەرزش بکەن. هەر چەندە ئەمکارە بۆ بەساڵداچوان درەنگە بەڵام بۆ دایك و باوکانی لاو دەکرێ وەرزشێك هەڵبژێرن. ئاوا ڕێگا وەرزشکردن پتر بۆ منداڵەکانیان خۆش دەکرێت.

جگە لە گەڕانی دەرەوی شار و وەرزش شێوەگەلی تری پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی هەیە، لەوانە نواندنی شانۆیی خێزانی، نووسینی دەفتەری بیرەوەری ڕۆژانە، نیگارکێشان. نامە نووسین بۆ دۆستان، بەشداری منداڵ لە پارێزگاری کردنی ماڵ یا ڕێکخستنی. پێکهێنانی یاری بە کۆمەڵ چ لە حەساری ماڵی یا لە گەشت و گوزار و بابەتگەلێکی دی. لە تێکڕای شێوەکانی پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتیدا چالاکی منداڵ بهەژێنرێ چاکە، نەك هەر فێر بکرێ گوێ بگرێ و سەیر بکا. بەڵکو دەبێ

شارەزابێ و ئارەزوو بکا، بیەوێ بە ئامانج بگا، هەوڵ بدا بۆ سەرکەوتن بەسر هەر کارێکدا و زاڵبوون بەسەر گرفتەکاندا و راکێشانی منداڵە وردەکان بۆ ئەم بوارە. دەبێ دایك و باوکیش بەرنامەی ئایندەیەکی نزیك بۆ منداڵەکانیان دارێژن و سەرەنجیان بۆ لای ئەو بەرنامەیە رابکێشن و چاودێری بەجێهێنانی بن. دەکرێ خوێندنەوەی کتێب و رۆژنامە و چوونە سینەما و شانۆگەری، سەردانی مۆزەخانە و شتگەلی لەم بابەتە بخرێتە ناو ئەو بەرنامەیە. راستە هەر بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی دەبێ شادیهێنەر بێ بەڵام شارەزا بوون و پێکەوەلکاندنی ئەم شادمانیە لەگەڵ بەرژوەندی مەزنی پێگەیاندن یەکێکە لە ئەرکەکانی سەرشانی دایك و باوك.

بە یارمەتی جۆرا و جۆر بوونی شێوازەکانی کاری کۆمەڵایەتی خێزان دەکرێ زۆر کاری گرینگ کە لە رووی پێگەیاندنەوە بایەخیان هەیە ئەنجام بدرێن.

## پەروەردەکردنی منداڵ لە ساڵەکانی سەرەتای ژیانی

لە داستانە کۆنەکاندا دەگێرنەوە دایکێك کورپە یەکسالانەکەی دەباتە لای زانایەك دەپرسێ پێم بڵێ لە کەیەو دەبێ منداڵەکەم پەروەردەبکەم

زانایەکە دەپرسێ تەمەنی چەندە

دایك دەڵێ: یەك ساڵ

زانایەکە دەڵێ: خاتوون تۆ دوانزە مانگ لە پەروەردەکردنی منداڵەکەت دواکەوتووی.

کەواتە پەروەردەکردنی منداڵ لە چرکەساتی یەکەمی ژیانییەوە دەستپێ دەکات، راستی ئەم بیرۆکەیە لە شێوەزەکانی پەروەدەکردنی هیچ گومانی تێدانییە.



زانستی پێشکەوتووی ئەمڕۆ دەڵێ لە دوو سێ ساڵی یەکەمی ژیان مرۆڤ هەم لەش و لاری کامڵدەبێت هەم بازدانێکی خێرایی رەوانی لە گەشەکردنی منداڵدا روودەدات ئەم بازدانە رەوانیەش لە خۆیەوە وەدینایات.

چالاکییەکانی منداڵ لەو کاتەوە پێدەنێتە ناو دنیا دەستپێ دەکات، فێری ڕوانین و گوێگرتن دەبێ. دەنگەکان دەردێنێ دەکەوێتە جموجۆڵ و فێر دەبێ چۆن جووڵەکانی کامڵ بکات، ئەو چالاکییە دیارانە تایبەت بە مانگەکانی یەکەمی ژیانیەتی. دوایی فێردەبێ وشەکان تێبگات سەربەخۆ وشەکان بە دەنگ دەربێنێ. یاری دەکا، فێر دبێ وەك منداڵەکانی دیکە بجولێتەوە. ئەمەش بەستراوەتەوە بە چۆنیەتی پەروەردەکردنی. هەر لە ساڵی یەکەمەوە ئاکارەکانی کەسایەتی خۆی بەرجەستە دەکات جا پۆزەتیڤ بێ یا نێگەتیڤ. وەك بەرگری کردن، ئارامی، گوێرایەڵی یا بە پێچەوانەوە گڕو گرتن و دڕدۆنگی.

هێندێك لە دایك و باوك پێیانوایە کە دەبێ منداڵە چکولەیان لە رووی بە جێگەیاندنی هەست و ئارەزوو و رەفتارەکانی بە تەواوی ئازادبێت. هەر لەسەر ئەم بنەمایە رێگەی دەدەن هەر کارێکی پێی خۆش بێ بیکا، تەنیا ئەوەندە ئاگادابن زیان بە گیانی خۆی نەگەیەنێ، پێشیان وایە بە تێپەڕبوونی کات رەفتارەکانی لە خۆوە چاکدەبن. ئەو خێزانانەی ئەم شێوازی پەروەردەکردنە بەرەوا دەزانن، لایەنی نێگەتیڤ رەفتاری منداڵەکەیان گەشە دەستێنێ و پێدەگا، خوخدەی خراپ و دزێووە خۆدەگرێ.

لە راستیدا منداڵەکە دوای ئەوەی گەورە دەبێ هەست دەکا نابێ رەفتارەکانی ئاوابێت بەڵام ئیتر بە سەختی دەتوانی ئەوەی دایك و باوکی فێریان کردووە تەرکی بکات.

گرینگترین ئامرازی پەروەردەکردنی منداڵ لە مانگی یەکەمدا پەیڕەوکردنی ئەو شێوازەیە کە بۆ خواردن و خەوتنی دیاریکراوە لە دووەم مانگیدا زۆربەی ژیانی خەوە لەبەر ئەوە پێویستە کاتی خەوتنی بە وردی بۆ تەرخان بکرێ. دوای ئەو دوو مانگە پتر بێدارە دەبێ فێر بکرێ لە چ کاتێکدا بخەوێ بۆ ئەمەش پێویستە تاکاتی خواردنی دێت سواری عەرەبانە بکرێ و بیگێڕن، چونکە دوای خواردن خەریکی قووڵ دایدەگرێ.

نەخشەی لە باری خواردن و خەو لەش و لاری منداڵ بەهێزدەکات و لە هەمانکاتدا بۆ سیستمی عەصەبیش سوودبەخشە. ئەو منداڵەی خوبەم نەخشەیەوە بگرێ گەلێك ئارام و لە سەرخۆترە لەو منداڵەی خواردنی کات و ساتی بۆ نییە.

هۆیەکی تر وەدیهێنانی کەش و هەوایەکی ئاسوودەیە بۆ پەروەردەکردن. گەرمترین و رووناکترین شوێنی لە ژووریدا بۆ لەبەرچاو بگرن. چەپەری خەوتنەکەی کە نەردەی هەیە لە شوێنکی ئاوا پێویستە دابنرێ. پیشیتەکەی بە ئەندازەیەك بۆ دروستبکەن تەنیا جێگای سەری ببێتەوە، زۆریش نەرم نەبێ باشە.

کاتەکانی تر پێویستە لەسەر جێگایەکەی خۆی بێ نەك لە باوەشی گەورەکاندا. دوای شەش مانگ پێشنیار دەکەین کە منداڵەکە بیداربۆوە دۆشەگەلەکەی لە ژێر دەربهێنێ، بە جێیی ئەوە پارچەیەکی بە دوو سێ قەدی بۆ رابخەن لە تکە مشممایەکی بەسەر دادەن. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەو نەك هەر بخزێت بەڵکو هەوڵ دەدا دەست بەسەر دەی چوار پایەکەوە بگرێت و هەستێتە سەرپێ و هەوڵی رۆیشتن بدات.

زۆر جار دەبینن لەسەر جێگایەکی راکشاوە خێرا خێرا دەستوپێی دەهەژێنێ سکی بەرز و نزم دەکا لە سیمایدا خۆشحاڵی دیارە کەنووی دێتی گرو گاڵ دەکات کە سەرەتایی پێکەنییە.



ئەم جمو جۆڵە گەرم و گورە گشتی بۆ منداڵ بە کەڵکە، ئەو دایکانەی منداڵەکەیان بۆ ماوەیەکی کورت دەخەنە سەرسك کارێکی باش دەکەن بۆ ئەوەی بتوانن سەرتاپای گیانی بخاتە جمو جۆڵ. ئەم دەبێتە هۆی پاراستنی چالاکی منداڵ و کامڵبوون هەڵسوکەت و جمو جۆڵی. جل و بەرگ لە کامڵکردنی جموجۆڵی منداڵدا بایەخی هەیە. بێگومان پێویستە منداڵ لە یەکەم رۆژەکانی ژیانیدا چوار پەلی ئازاد بێ، قول و قاچی بە پارچەیەکی تایبەت وەك قۆنداغە داپۆشرێ تابتوانێ بە ئاسانی بجولێ حاڵەتی لەشی خۆی بگۆڕێ. دەتوانی بەو شتانەی لەسەر سەریەوە هەڵدەواسرێن سەرگەرم بێ و گرو گاڵ بکات.

لە سێ مانگی یەکەمی ژیانیدا دەکرێ هێندێك مور و خرخاڵی گەمە کردن لەسەر جێگایەکەی بۆ هەڵبواسرێ، بەڵام نابێ بەرەو چاوانی بێت بەڵکو لەسەر ئاستی سنگیەوە بێت تا بە ئاسانی سەیریان بکات، دووری ئەو شتانە لە چاویەوە ٤٥ تا ٥٠ سم بێت باشە.

لە دوو مانگیدا تەنیا سەیری ئەو کەل و پەلی گەمانە دەکات کە لەبەر چاونی. وەلێ لە سێ مانگیدا هۆگریان دەبێت هەوڵدەدا دەستیان بۆ درێژ بکات، دەستیان لێبدات. لەو کاتانەدا ئەگەر لیی وردبنەوە دەبینن لەگەڵ جولانی دەستەکانی قاچەکانی لە ئەژنۆ بەرەو سەر بەرزدەکاتەوە. لەو تەمەنەدا دەکرێ لە جیاتی تۆپ چەند ئەلقەی رەنگا و رەنگی بۆ هەڵبواسرێ ئەوسا دەستە خنجیلەکانی بۆ رادەکێشی و هەوڵدەدا بیانگرێ. پێویستە کەل و پەلی گرو گاڵی بدرێتێ تا پراکتیکی گرتن فێر بێت.

لە چوار مانگیدا هەندێك جمو جۆڵ ئەنجامدەدات کە پێشەنگی فێربوونی دانیشتنە. هەڵەی گەورەی دایکان ئەو کاتەیە کە منداڵەکەیان ناتوانێ دانیشێ و ئەوان دایدەنێشێنن، چونکە ئەمە دەبێتەهۆی گۆڕانی شێوەی مۆرەکانی بڕبڕەی پشت و

سنگ و پەراسووی لەو حاڵەتەدا هەموو قورساییەکەی دەکەوێتە سەر تۆڕێکی ماسولکەی لاواز و بڕبڕەی پشتێك کە هێشتا خۆی نەگرتووە. با لە بری ئەوە فێری چەند جوڵانی بە کەڵکی بکات. بەرەو پشت درێژی کا ژێر هەر روو ئانیشکی بگرێت و بەرزی کاتەوە. دۆخێکی نیوە دانشتوویی بۆ بڕەخسێنێ. دواتر ئازادی کات بەپشدا درێژ بێت، لەوەش گرینگتر ئەوەیە دەرفەت بداتە منداڵەکەی بە ئارامی لەناو پێخەفەکەیدا جمو جۆڵ بکات و بکەوێتە سەر دەست و پێ. ئەم کارانە دەبێتەهۆی ئەوەی منداڵ وردە وردە سەربەخۆ توانای دانیشتن بە دەست بێنێ، لە مانگەکانی هەشت و نۆدا ئەم کردەوەیە ئەنجامدەدا. ئەوسا دەتوانێ بە ئاسانی دابنیشێ. خۆ ئەگەر لە پشت مەچەکیەوە هەر دوو دەستی بگرن و هەڵیکێشن، لە هەردوو تەنشتیەوە کەمەری رابگرێت دەتوانێ دانیشێ، ئەمەش تا هەفتەیەك یادوو هەفتە دەبێ بخایەنێ کەمکەمەش لەم بابەتەوە مەشقی پێبکرێ.

لەگەڵ ئەمەدا ئۆرگانیزمی لەشی منداڵ ئامادە دەبێ تابتوانێ لەسەر پێ بوەستێ. ئەگەر بنهەنگڵی منداڵێکی پێنج مانگە بە هەردوو دەست بگریت دەبینی هەردوو قاچی پێکەوە رەق دەکا و دەینێتەوە سەر ئەژنۆت لە لایەن قاچەکانیەوە هەست بە گوشارێکی توند و پڕانرژی دەکەیت، ئەمە خۆی بەڵگەیەی ئەوەیە بە باشی خۆی ئامادە دەکات بۆ وەستان.

باش نییە کاتێکی دوور و درێژ منداڵ سەرگەرمبێ و گەمەی لەگەڵ بکرێ، یا لە باوەش بگیرێ. چونکە سەربەخۆیی کاری خۆرسکی منداڵ تێکدەدا. ئەو دایکانەی لەگەڵ هەر گریانێکدا منداڵەکەیان لە باوەش دەگرن، هەوڵدەدەن بەم شێوەیەژێریکەنەوە منداڵەکە فێردەکەن بە گریان ئارەزووەکانی بە جێبگەیەنێ و لە ئامێزی بگرن، لە شەش مانگی بەو لاوە دەبێ لەگەڵ منداڵەکانی دیکە و گەورەکان هاو دەم بێ. دەست هەڵبڕێ وەك ئاماژەی سڵاوکردن.



رێگە مەدەن کاری زیانبەخش ئەنجامبدا، وەك چرنوك گرتن لە دەم و چاوی منداڵەکانی دیکە و پرچ راکێشانیان. ئەمەش بە گەشەکردنی منداڵەکەوە بەندە، پێویستە دایك و باوك گاڵتە و گەمەکانی بخەنە ژێر چاودێری.

لە ساڵی دووەمدا گەمەکانی منداڵ رەهەندێکی تایبەت و قووڵ وەخۆدەگرن. بوکەڵەکەی لە پەڕۆیەك وەردەپێچێ یا نان بە دەمی ورچەکەیەوە دەکات، بەم پێیە واباشە پێداویستی گەمەکردن دیکەی مانادار بخرێتەسەر پێداویستەکانی ساڵی پێشووی وەك (بوکەڵە، ورچ و شێوە ئاژەڵی تر، موبیلیات و قاپ و قاچاخ).

ساڵی سێهەم کاتی ئەوە هاتووە ئەو بووکەڵانەی بدرێتی کە بتوانێ جل و بەرگیان لەبەربکات. قاپ و قاچاخ و پێداویستی لە شێوەی حەیواناتی جۆرا و جۆر بۆ دابین بکرێ هەروەها (کەل و پەلی گواستنەوە، شەمەندەفەر، ئۆتۆمۆبیل، بەلەم، عەرەبانە و تیکە و پارچەی دروستکردنی خانوچکەی منداڵان).

لە رووی پەروەردەکردنەوە زۆر گرنیگە منداڵ خووبگرێ لە گەمەکردندا لەگەڵ منداڵانی دیکە هەڵکا. ئەم هاودەمی پێکهەڵکردنە و تێکەڵبوونە مەرجێکی زۆر پێویست و باشی کامڵبوونە.

## پێداویستەکانی گەمەکردنی (کۆرپە)

نابێ ئەوە لە بیربکرێ کە چالاکی تایبەت بە تێکەڵبوون لەگەڵ دەوروبەر تەنیا لە دوو سێ مانگی تەمەنی منداڵدا نییە. دوا بە دوای ئەوە هەوڵدەدا پتر و پتر لەگەڵ دەوروبەر بگونجێ (وەك بەکارهێنانی دەست بۆ پارێزگاری خۆی، وەلانانی شتومەك، دەستلێدان و بۆ دەم بردنیان و شتی لەم بابەتانە). لە پێنج مانگی بەو لاوە تەنیا منداڵ ئارەزووەکانی دەرنابڕێ بەڵکو بە زمانی هەمووان بوونی خۆی دەردەخا یاری بەو شتانە دەکات کە لەبەر دەستیەتی لەهەر روویەکەوە لێیان

وردەبێتەوە. لە رووی تام و چێژ، زبری و نەرمی، لە رووی دەنگ و بابەتی تر. نایەکسانی قۆناغی یەکەمی گەمەکانی بە هەرچی لەبەر دەستی دابێت بەسەردەبات و کامیانی بە دڵبێت یاری پێدەکات. گەشەکردنی منداڵ سەرەتا بە ئاشنابوون لەگەڵ رەنگەکان دەست پێدەکات. هەوڵدەدا بە گورجی پوڵێنیان بکا، هەر بۆیە پێداویستەکانی گەمەی منداڵ پێویستە هەموو رەنگەکانی تێدابێت یا ئاوێتەی دوو رەنگ و سێ رەنگ بن.

دواتر لەم تەمەنەدا پێویستە تائەو جێگەی دەکرێ کەل و پەلی یاری پتر بدرێتێ وەك تۆپ، ئەڵقە، شمەکی خاوەن شێوەگەلی جۆرا و جۆر، تا منداڵ بتوان. فۆرم و کلێشەی جیاجیان پێ دروست بکەن. شتەکان بە دەستەوە دەگرن بەم پێیە رووی دەرەوە و ناوە، لوس و زبریان دەناسن و لەگەڵ لایەنەکانی تری ئاشنا دەبن. لەم تەمەندا ئەڵقە و خرخاڵ هەڵواسراو زۆرباشن.

لایەنێکی گرینگ تر دەرککردنی دەوروبەرە وەك ئەو دەنگەی هەر شتە تایبەت بە خۆی هەیەتی. دەنگی کەل و پەلەکانی گەمە کردن بۆ منداڵی کۆرپە پێویستە وەك ئەو شەقشەفە و زەنگوڵانەی دەنگیان خۆشە، تەپڵی چکۆڵە و بابەتی ئاوا بۆ ئەم مەبەستە لە بارن. هەتا کۆرپەلەکان هێندێك کەل و پەلی گەمەکردنیان پێ لە هێندێکی تر باشترە هیچیان لێیان وەرەزناین. بە تاوتوێکردنی ئەم فاکتەرە دەگەینە ئەم دەرئەنجامە کە پێداویستەکانی گەمە کردنی منداڵ تا تەمەنی یەکساڵی پێویستە سوکەڵە و دەنگداربن.

## بارهێنانی وەرەی منداڵ

چۆن وەرەی مرۆیی کامڵدەبێ و لە چ تەمەنێکدا دەتوانین ئاکارەکانی وەرەی منداڵ بە هێز بکەین؟



ئەندازەی ورە زگماکی نییە. هیچ مرۆڤێك بە ورەیەکی بە هێز یا لاواز لە دایکنابێ و بە میرات  لە دایك و باوکیانەوە بۆی بە جێنامێنێ. ورە لە بواری چالاکی مرۆڤایەتیدا دروست دەبێت پشکی سەرەکی کامڵبوونی لە ئەستۆی هەل و مەرجەکانی ژیان و پەروەردەکردندایە.

ئەگەر منداڵێك زیاد لە ئەندازە دەستبەسەری گەورەکانی بێت ناچار نەبێ بۆ گەیشتن بە ئارەزووەکانی کەمترین هەوڵبدات، ئەوا ئەستەمە بتوانێ ببێتە مرۆڤێکی خاوەن بیر و باوەڕو خەسڵەتگەلی نەگۆڕ.

زۆر جار دایك و باوك دەڵێن لە منداڵێکی چوار ساڵە چی چاوەڕوان دەکرێ؟ هێشتا زۆر منداڵە هیچ تێناگات گەورەبێ ئاقڵتر دەبێت ئینجا ئامۆژگاری دەکەین. ئەم بۆچوونە هەڵەیە بەرپرسیاربوونی منداڵ ئەلبەتە لە سنووری توانای خۆیدا کارێکی پێویستە واتە هەر لە سەرەتای ژیانییەوە دەست پێدەکا لەوساتەوە کە بانگی دەکەی و تێدەگا و دەیەوێ بدوێ.

کیژۆڵەیەکی دوو ساڵە دەبینێ دایکی سێوی پێیە داوای سێوێکی لێدەکات دایکی لە وەڵامدا دەڵێ: (سەبر بگرە کە نانی نیوەڕۆت خوارد دەتدەمێ). بەڵام منداڵەکە نایەوێ سەبربگرێ دوای دایکی دەکەوێ و دەستدەکات بە گریان و گڕوو دەگرێ، سەرئەنجام دایکی ناچاردەبێ ((ها ئەوە سێوە بگرە برۆ بێزارت کردم)). ئەویش رازی دەبی و چونکە بە مەبەستەکەی گەیشتووە. بە دڵنیاییەوە جارێکی دیکەش ئاوا هەوڵدەدا بە نیازی خۆی بگات. وەلێ دایك زیانی بە منداڵەکەی گەیاندووە واتە بە جۆرێکی وای بارنەهێناوە سەبر بگرێ و بۆ ماوەیەکی کورت دەست لە داوایەکەی هەڵگرێ. ئەم سەبر و خۆراگرییە یەکێکە لەو ئاکارانەی لەگەڵ ورە پەیوەستن. هیچ ماشێنێك ناتوانێ بێ ئستۆب بێ و هیچ ورە و ویستێکیش بی هەڵویستە. ورە و ویستی بە هێز تەنیا ویستن و سەرکەوتن نییە، بەڵکو زاڵ

بوونیشه بەسەر نەفسی خۆدا. ئەگەر منداڵ خووبگرێ گروەکانی رەنیۆ بێنێ و هیچ کات هەڵوێسته یەك نەکات، هەرگیز ورەیەکی بە هێز و نەفسێکی بەرزی نابێت.

ورە و ویستی کامڵ و پێگەیشتوو ئاکارێکی ئاوێتە یەکە لە ژێر کاریگەری جیهان بینی بنەماکانی ئاکار و ویستی مرۆیانە، شایستەیی و دەستهەڵنەگرتن لە ئامانج و شتگەلێکی لەم بابەتانە، کامڵدەبێ. ئاساییە کە ناتوانین ویست و ورەی منداڵێکی چکۆڵە لەگەڵ ویست و ورەی مرۆڤێکی گەورە و پێگەیشتوو پێکبگرین. لای منداڵ تیۆری و میتۆدی بە ئاگا و بە دواداچوونی ئامانج لەگۆڕێ نییە بەڵام دەکرێ لە بارەی پێشەکییەکانی بارهێنانی ورە و ویستی منداڵ بدوێین کە ئەم بنەمایانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- بوونی ئارەزووی بە دواداچوونی مەبەست.

٢- پاراستنی ئەو ئامانجە بەبێ گوێدانە ئەو شتانەی منداڵەکە لەو ئامانجە دوور یا نزیك دەخەنەوە.

٣- توانا و شایستەی منداڵ لەمەڕ دانبەخۆداگرتن و دواخستنی ئارەزووەکان.

٤- توانای سەرکەوتن بەسەر گیروگرفتەکان بە مەبەستی گەیشتنە ئامانج.

شێوە و فۆڕمگرتنی ورە و ویستی منداڵ دەبێ لەسەر هێمای کامڵبوونی ئەو ئاکارانە بێ کە بۆ رەفتاری کەسێکی پێگەیشتووی خاوەن ویست و ورە پێویستە واتە شارەزابێ کاتێك ئامانجێك لەبەرچاو دەگرێ راست و رەوان وەدووی کەوێ و چالاکی بنوێنێ.

پێش هەموو شتێك دەبێ نە زمینەی رێك و پێکی ژیانی رۆژانە بۆ منداڵ لەبەرچاو بگیرێ تا بە وردی بزانی لە چ کاتێکدا چ کارێك دەکا و چۆن بە ئەنجامی دەگەیەنێ. وەك لە خەوهەستان و نانخواردن. چوونە ناو پێخەف. دەست شتن پێش



نانخواردن، کۆکردنەوەی پێداویستەکانی گەمە کردن پێش خەوتن شتگەلێکی لەم بابەتانە. ئەمانە رێك و پێکی بە جمو جۆڵەکانی دەبەخشێ و ئەو ئاکارانە دەخولقێنێ کە بە ویست و ورەوە بەندن.

دەبێ گەورەکان بە یەك شێوە لەگەڵ منداڵ رەفتار بکەن، هیچ شتێك لەوە خراپتر نییە دایك و باوك لەسەر پەروەردەکردنی منداڵ دوو بڕوا و بۆچوونی جیاوازیان هەبێت، بۆ نموونە باوك رێگەی منداڵەکەی نادات کارێکی دیاریکراو ئەنجامبدا کەچی دایکی رێگەی دەدا. لە ئاکامی ئەم رەفتارە منداڵ دوو روو، بە کردەوە فێڵباز و ساختەچی باردێت. لە پەیوەندی کردن لەگەڵ منداڵدا دەبێ گەورەکان راستگۆبن و خاوەنی قسەی خۆیان. وادێتە پێش بۆ بێدەنگ کردنی منداڵ گەلێك بە لێن و گفتی پێدەدەن. بۆ نموونە ئامێری گەمە کردنی بۆ دەکڕن ئەگەر نە گریا و گرونە گرێ. منداڵ بێدەنگ دەبێ وەلێ هەر چاوەڕانی بە جێگەیاندنی بەڵێنەکانە، ئەوانیش لە بیریان چۆتەوە چیان گوتووە. لە ئاکامدا منداڵ خوودەگرێ پشت بە بەڵێنەکانی دایك و باوك نەبەستێ، ئەویش فێردەبێ بە ئاسانی بەڵێن بدات و بە جێنەگەیەنێ. بەم پێیە وابارنایات هەست بە لێپرسینەوە بکات لە ئاست گفت و بەڵێنەکانی (واتە خاوەنی قسەی خۆی نابێت/ وەرگێڕ).

دەبێ منداڵ واباربێ لە ئاست ئارەزووەکانی دان بە خۆیدا بگرێ. هەست و نەستەکانی کۆنترۆڵ بکات و بەسەر ترس و ئازاردا زاڵ بێت. ئەمانە هەموویان وەر و ویستی منداڵی پتەو دەکەن. دەبێ فێر بکرێ ئەو کارانەی ماندوو بونیان تێدایە خۆی ئەنجامیان بدات. خۆی کەل و پەلەکانی گەمەکردنی کۆبکاتەوە، جلەکانی داکەنێ، لە بەریان بکات، شتگەلی لەم بابەتانە، هەروەها پێویستە هەستی یارمەتیدانی بە هێز بکرێ (سفرە و مێزی نانخوارد خاوێن بکاتەوە، گوڵەکان ئاو بدات و گەلێك کاری تر). ئەگەر کارەکان نیوەچڵیش بکا قەیناکا گرینگ ئەوەیە ئەم کارانە هەست و نەست واتە خەسڵەتە بنەڕەتیەکانی ورە و ویستی منداڵ

پەروەردە دەکات. گەورەکان دەیانەوێ هەموو کارێك لە جیاتی منداڵەکانیان ئەنجامبدەن نازانن بەم ڕێگەیە زیان بە سەربەخۆیی منداڵەکە دەگەیەنن. تامنداڵ گەورەتر بێ پێویستە ئیش و کاری پتر پێ بسپێرن تا پتر گوێبداتە بڕیارەکانی دایك و باوك پەیڕەویان بکا و خەسڵەتەکانی ورە و ویستی پتر بکەونە بەر راهێنان.

گرنیگ ئەوەیە دایك و باوك بزانن چ شتێك بەوانەوە بە ستراوەتەوە و کامڵبوونی ورە و ویستی بە چ ڕێگایەکدا دەڕواو ئەو ساڵانە لە کیسی نەچی کە بناغەی ورە و ویستی تیادا دەرێژرێ.

## هەڵسوکەوتی ئەو منداڵانەی کاتی چوونە قوتابخانەیان هاتووە

منداڵی ساغلەم هۆگری هەموو شتێکە، زۆر دەجۆلێ، گەمان دەکات هەمیشە سەرقاڵە. ئەم بزۆزیە بۆ کامڵبوونی گشتی منداڵ گەلێك پێویستە. ئەوانە یارمەتی دەدەن لەگەڵ جیهانی دەوربەری ئاشنا بێت. ئەو جیهانەی پڕە لە شتی تازە و سەرنج ڕاکێشی جۆرا و جۆر.

چالاکی بنەڕەتی منداڵ گەمە کردنە. لە گەمە کردندا بازدەدا هەڵدەخلیسکی، هەڵدەستێ، دادەنیشێ. ئەمانە دەبنە هۆی کامڵبوونی جوڵانەکانی. لەگەڵ ئەو شتانەی بۆ گەمە کردن بەکاردین ئاشنا دەبێت وەك شەشپالو، خێر و، چەو، لە تایبەتمەندی هەریەکێکیان شارەزا دەبێت. لە گەمە کردندا گفت و بەڵێنی بە یەکتری دەدەن وتووێژ دەکەن دەورەکان لەناو خۆیاندا بەش دەکەن. لە هەمانکاتدا فێری دۆستایەتی دەبن.

هەر چۆنێك بێت دایکان و باوکان پێویستە کەل و پەلەکانی گەمە کردنی منداڵەکانیان بپارێزن و بزانن ئەوانە تەنیا ئامرازێکی خۆخافڵاندن نین بەڵکو مەسەلەیەکی گرینگ و تابڵێی جیبیدیە.



هێندێك لە دایکان و باوکان دەیانەوێ منداڵەکەیان دەستە وەستان واتە بێکار بێ و هەمیشەش بێدەنگ. ئەمە نەبوونی پێداویستیەکانی گەمە کردن دەبنە مایەی خەم و پەژارە و گرو گرفتی منداڵ.

ئەو منداڵانەی لەگەڵ گەمە کردن رانەهاتوون شەڕەنگیز و ستەمکار یا هێمن باردێن ئەم منداڵانە بە ئاسانی نەخۆش دەکەون. زۆر بەسستی گەشە دەکەن. دواتریش لە قوتابخانە باش دەری ناخوێنن.

منداڵان مەزندەی کات و هێزی خۆیان نازانن، لەبەر ئەوە پێویستە گەورەکان جۆری چالاکییەکانیان بۆ بڕەخسێنن. منداڵان لە خۆخافڵاندن بە شتێکەوە وەڕەز دەبن. ماسولکەر کانی ئەو منداڵەی هێشتا نە چۆتە قوتابخانە لەگەڵ سیستمی عەسەبی دووبارە کردنەوەی یەکجۆرە گەمە ماندوو دەبن. بۆ نموونە زۆر گوێراگەتن لە خوێندنەوەی کتێب و پیادەڕۆیی دوور و درێژ. وەلێ لەوەش منداڵان بە تێکڕایی لە دانیشتن بێ جمو جۆڵ تەنیا لە یەك جێگا و لەگەڵ یەك جۆرە گەمەی نابەدڵ وەڕەز دەبن.

## گەڕان

دوای ئەو گەمە و خۆخافڵاندن و سەرقاڵیانەی منداڵ کە پەیوەندیان لەگەڵ بیرکردنەوەیدا هەیە. منداڵ پێویستی بە جمو جۆڵە کە بە هۆی گەڕان دابین دەکرێ. تەراتێن و ڕاکردن و بە دەنگی بەرز ئاخاوتن لە هەوای ئازادا. زستان گەڕانی منداڵ دەبێ ٣,٣٠ تا ٤ کاتژمێر بێ لە ڕۆژێکدا (٢ کاتژمێر بە بەیانیان و دوو کاتژمێر ئێواران) لەگەڵ گەرم بوونی کەش و هەوا ئەو ماوەیە دەبێ ٤,٥ تا ٥ کاتژمێر بێ وەلێ منداڵ هاوینان دەبێ زۆرتر لە دەرەوەی ماڵ بێ.

بەبێ گوێدانە کەش و هەوا پێویستە گێرانی منداڵ هەموو ڕۆژێك هەبێت. هەتتا ئەو کاتەی بارانیش بباریێ پێویستە لە ماڵ ببرێتە دەریێ ئەڵبەتە لەگەڵ گەورەکان تا وریابن منداڵەکە لە پێویست بەدەر غارنەدا، بە توندی نە دوێ و گۆرانی نەڵێ نەکو تووشی نەخۆشی بێ. گەڕان لە هەر جۆرەکەش و هەوایەك دابێ جگە لەوەی دەبێتەهۆی کاملبوونی لەش و لار بەرگری ئۆرگانیزمی لەشی منداڵ بە هێزدەکا.

گەڕان لە ورزەکانی ساڵ و کەش و هەوای جۆرا و جۆردا کاراکتەرێکی تایبەتی هەیە. لە زستاندا کە هەوا ساردە دەبێ منداڵ پتر جمو جۆڵی هەبێت. بەفر بماڵێ، تۆپەڵەی بکا، بارێکە رێگا بکاتەوە کۆ بەفرێك بۆ ورچەکەی دروستکا. لە سندوقچەیەکیدا دابنێ و بە پەتێك رابکێشرێ و جۆرێکی تر لەو گەمانەی منداڵ خۆشحاڵ دەکا خزین لەسەر تەپۆڵکەی نەوی و خلیسکەکردن و دروستکردن کۆ بەفری جۆرا و جۆر وەك (منداڵە بەفرینە، بابا نوئێل و خانووە بەفرینە).دروستکردنی تۆپەڵە بەفر و نیشانەگرتن لەسەر دیواری خاڵی.

دوای گەمە کردنی تەواو پێویستە پشوویان بدرێتێ، پێشنیار بکرێ چ باڵندەیەك بە ئاسمانەوە دەفرێ داستانێکی چکۆڵەیان بۆ بگێرنەوە و مەتەڵێك یان لێ دابێنن.

ئەگەر منداڵ زۆر ست و بێ جمو جۆڵ بوو دەبێ فێر بکرێ پتر بجوڵێ و لە گەمەی منداڵاندا بەشداری بکات وەك چۆڵەکەیەك رەگەێیان بکەوێ نەسرەوێ، تالای درەختێك غاردات و بگەڕێتەوە گەورەکانیش دەبێ چالاکانە بەشداریان بکەن.

دایك و باوك پێویستە بزانن تێکڕای منداڵان بە تایبەتی تاقانە پێویستی بە هاوەڵ و هاودەم هەیە تا لە گەمە کردن لەگەڵیاندا دۆستایەتی و پێکەوە ژیان و هاوکاری، لە خۆی بوردوویێ فێر ببێ.

لە هەموو هەل و مەرجێکدا گەمەی بە کۆمەڵ ئاسانترە دەتوانن منداڵان کۆبکەنەوە گەمەی پڕ چالاکی و جمو جۆڵی رێکخەن. دەتوانن لەگەڵ ئەو



دراوسێیانەی منداڵی هاوتەمەنیان وتووێژ بکەن تا یەکێك لەو منداڵانە هەمیشە ئاگای لەگەمەکان بێ و رابەرایەتیان بکا.

## شادی

نەزمی ژیانی منداڵ دەبێ ئارام ئاسوودە و هاوسەنگ بێت بەڵام ئەمە نابێتە هۆی وەك یەك بوونی ژیانی. ئەگەر ئەمرۆ وەك دوێنێ بێ و رۆژی پشوو لەگەڵ رۆژی ئاسایی جیاوازی نەبی منداڵ وەڕەزدەبێ.

ئاقڵانەیە ئەگەر دایك و باوك هەوڵبدەن ژیانی منداڵ هەمە چەشنە بێت و خۆشحاڵ بێ. وەلێ هەموو کەس نازانێ چۆن ئەم کارە ئەنجامبدات. هێندێك جار بۆ خۆشحاڵی و چالاکی منداڵەکانیان شیرینی زۆر و کەل و پەلی گەمە کردنیان بۆ دەکڕن دەیانبەنە سەیری شانۆ و سینەما و دەچنە میوانی. ئەگەر ئەمانە ببنە خووخدە ئیدی چیتر منداڵەکە خۆسحاڵ ناکەن. چونکە ئەوان ویست و داوای یەکلەدوای یەکیان هەیە.

یا دەیانبەنە میوانی یا ئاشنایان میوانیان دەبن. گەورەکان زۆرتر خەریکی وتووێژی خۆیانن و ناپرژێنە سەر منداڵەکەیان. منداڵانیش لەم بارودۆخەی هاتوتە پێش کەڵك وەردەگرن. دەستدەکەن بە یاری پڕ جمو جۆڵ. وتەگەلی دەبیستن کەبۆیان سەیر و نامۆیە، گەدەیان بە خۆراکی نابەجێ پڕدەکەن و درەنگ دەخەون تامی خەوێکی ناخۆش دەچێژن. ئەم لە گرێژنە چوونەی نەزمی ژیانی منداڵ زیانێکی مەزن بە سیستمی ئەعسابی دەگەیەنێ.

ئەو دایك و باوکانەی دەیانەوێ پتر منداڵەکەیان رازی بکەن، دەیانبەنە سەیری شانۆ و سینەما، منداڵەکەنیشیان لە روانینی و دوور و درێژ ماندوو دەبن. لە ناوەڕۆکی فیلم یا شانۆگەریەکە تێناگەن هەواش گەرم خنێکێنەرە. پاش تاوێك یا

توڕەدەبن. یا بە پێچەوانەوە بێواز دەبن و گوێی نادەنێ، شادمانیەکی ئاوا بۆ سیستمی عەسەبی منداڵ زیانبەخشە. دایك و باوکانیش پاسا و دێننەوە دەڵێن: (منداڵەکەمان زۆر حەزی لە سینەمایە بۆ خۆی پێیخۆشە بچینە سینەما). ئەو منداڵە هێشتا نازانێ چ شتێك بەکەڵکە و چ شتێك بێکەڵکە. ئاساییە فەزاییەکی نوێ جێگایەکی چراخان و رووناك، کۆمەڵێك خەڵکی تێدا کۆبۆتەوە، سەرنجی رادەکێشێ. بەڵام ئەو گەورانەی پەروەردەکردنی منداڵیان لە ئەستۆیە دەبێ پێش هەموو شتێك بزانن نابێ تەنیا بیر لە رازی بوونی منداڵەکەیان بکەنەوە بەڵکو دەبێ لە نوختە تیگای سوود یا زیان بۆ ساخلەمی منداڵەکە مەزندە بکرێ.

## چۆن یارمەتی منداڵ بدرێ تاباش دەرس بخوێنێ

وەڵامی ئاسایی ئەم پرسیارە تەنیا وەڵامێکە ئەویش بریتییە لە کۆنترۆڵ کردنی منداڵ لەمەڕ ئامادەکردنی مەشقەکانی ماڵەوە.

منداڵ هەر رۆژە شتێکی نوێ لە قوتابخانە فێر دەبێ. دەبێ ئەو زانیاریانە لە ماڵێ بە خەستی فێربێ. باوترین شێوە بۆ ئەوەی منداڵ بتوانێ بە قووڵی زانیارییەکان وەربگرێ پرسیاری زارەکییە کە لەناو پۆلە ئاراستەی دەکرێ. وەلێ مامۆستا هەموو رۆژێ ناتوانێ پرسیار لە هەموو قوتابییەکان بکات، کەواتە بەشێك لەو زانیارییە نوێیانە کە منداڵ وەریدەگرێ بەشێوەیەکی نێگەتیڤ لە مێشکیدا دەمێنێتەوە، دەرکی نێگەتیڤئاسای ئەم زانیاریانە نەك کە هەر ئاستی دێنێتە خوارێ بەڵکو هۆگری و خولیای منداڵەکە لە بەین دەبا، لەبەر ئەوەیە یەکالاّ کردنەوەی زانیارییەکان نەك هەر گرینگترین ئەرکی سەرشانی قوتابخانەیە بەڵکو ئەرکی دایك و باوکیشە. بۆ نموونە سەلماندنی شەو رۆژ بوونەوە. هاتنی بومەلەرزە، بارینی بەفر و باران و شتی تر.



بەم پێیە ئەو دایك و باوکانە منداڵەکەیان باش دەرس دەخوێنێ و لە لایەن وەرگرتنی نمرەی بەرزەوە ئاسودەن لە خوێندنی بێخەم و گوێ نادەنە چۆنیەتی خوێندنەکەی ئەوا دەبێ بڵێین تەواو بە هەڵەداچوون.

دایکی منداڵێك لە کۆبوونەوەیەکی سەرپەرشتیاری قوتابیان گووتی: من و مێردەکەم دەست لە کاری خوێندنی منداڵەکەمان وەرنادەین و هەرگیز هیچی لێناپرسین چونکە بەبێ ئێمەش هەمیشە باشترین نمرە وەردەگرێت، ئەو منداڵە قوتابی پۆلی شەش سەرەتایی بوو.

دایکی منداڵێکی تریش لایەنگیری قسەکانی ئەو ژنەی کرد و گووتی: کاتێك منداڵ بە باشی دەری بخوێنی ئیتر پێویستی بە یارمەتیدان نییە.

ئایا هەق بەو دایکانەیە؟ بێ پێنچ و پەنا، نەخێر، منداڵ چ لە کارە سەرکەوتووەکانی چ لەو کارانەدا کەشکسی خواردووە پێویستی بە لالیکردنەوەی دایك و باوکە، جگە لەوە ئەو دوو دایکە ئەوەندە دڵنیان کە زانیاری منداڵەکەیان هێند بە قووڵی دەرککراوە تابیێتە بناغە بۆ زانیاری پتر لە پۆلەکانی سەرووتر؟

ئەزموونەکانی فێرکردن نموونەی ئەوتۆیان هەیە کە زانیاری باشی قوتابیگەلێکی تایبەت تەنیا لە رووی توانای باشی دەرخکردن و گوێڕاگراتنەوە بە دەست هاتووە وەلێ بە قووڵی هەرس نەکراوە و نەبۆتە بیر و بڕوا لە کامڵکردنی بیر و هۆشیدا زۆر سوودبەخش نەبووە و شوێنەواری لە پۆلەکانی سەرووتر دەرکەوتووە.

ئەو دایك و باوکانەی بە وەرگرتنی نمرەی باشی منداڵەکانیان ئاسوودەنین، هەقیانە بەردەوام چاودێری خوێندن و گەشەکردنی گشتی منداڵەکەیان بن.

بەرینکردنی روانگەی منداڵ، رۆچوون بە قوڵایی زانیارییەکانیدا، کە شایسەتی ئەوە بێ زانیارییەکانی بکاتە بیر و بۆچوون، تێکڕای ئەم کارانە لە ڕێبازگەلی جیا جیاوە ئەنجام دەدرێن.

من نموونەیەك لە ئەزموونی خانەوادی خۆم دێنمەوە.

ئومیدی کوڕم قوتابییە. باش دەخوێنی لە بواری فێر بوونیدا هیچ دوو دڵیەکم نییە، جگە لەوە خێزانیشم لە کاتی پێویستدا چاودێری خوێندنییەتی، ئەگەر بکرێ ئاوا وێنای بکەم دەبی بڵێم بواری کاریگەری سەر منداڵەکەمان بەشکردووە، بەشی وردەکاریەکانی فێربوون لە ژێر چاوادێری خێزانمدایە. بەشی زانیارییە مرۆییەکان لە ژێر چاودێری منە، کوڕەکەم پرسیارێك بە راستی حەلّ دەکا، من دەپرسم: ئومید تۆ بۆ بەم رێگایە حەلی دەکەی. بەشکم رێگەی تر هەبێ بۆ حەلکردنی ئەم پرسیارە؟

- ئومید کەمێك رادەمێنێ و دواتر دەڵێ ئەوەیان ئاسانترین رێگای حەلکردنی ئەم پرسیارەیە.

- دەڵێم بە وەڵام بیسەلمێنە ئەوە سادەترین رێگایە، ئەویش دەیسەلمێنێ.

هەروەها ها ئەو شەوانەی پێکەوە بڕیار دەدەین وتوویژ بکەین کوڕەکەم خەنی دەبێ بۆ هەریەك لەو وتوویژانەی پێشوەخت بڕیاری لەسەر دەدەین هەمیشە هەوڵدەدەم لەسەر بەڵێنی خۆم بم و خۆی بۆ ئامادە دەکەم. لەم وتوویژەی شەوانە هەم لە رووی خوێندن و هەم لە رووی ئاکامەکانی پێگەیاندن کەلّك وەردەگرم.

بۆ نموونە لە نوختە نیگای جوگرافیەوە لە پۆلدا باس لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی دوور و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوانە (ئێران) دەکرێ، ئێمەش وتوویژەکەمان لەوێوە دەستپێدەکەین دەپرسم لە ئێران دا چ شتێك بایەخی هەیە؟



کەسێك بیردەکاتەوە بە یارمەتیەکی کەمی من دەگاتە دەرئەنجامێکی راست لەمەڕ رووداوەکانی ئەم دواییەی ئێران.

- رۆژی دواتر لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بە دوای ئەو وتارانەدا دەگەرێ کە لە بارەی ئێران دەدەوێن کە پێشتر گفتوگۆمان لەسەر کردووە. دوای چەند رۆژێك بە خۆشحاڵیەوە گوێبیستی دەبم کە کۆڕی ئاوەڵەکانیادا چۆن بە گەرمی لەسەر ئێران دواوە. لە جێگای خۆیدایە جارجار پرسیارێك سەرەتا تێگەیشتنی سەخت بێ، بخرێتە بەردەم منداڵ و دەرفەتی بدرێتی بیری لێبکاتەوە، لەسەری بدوێ و بکەوێتە جموجۆڵ.

باوکی یەکێك لە قوتابییەکان تێگەیشت منداڵەکەی لەگەڵ هاوەڵەکەی گوێ نادەنە دەرسی جوگرافیا: هیچ گوێیان نەدەدایە ئەو بابەتەی زەوی بە دەوری تەوەری خۆیدا دەخولێتەوە باوکەکە لێپرسین ئاخر چۆن دەبێ زەوی بە دەوری خۆیدا بجولێتەوە؟ بۆ نموونە (تۆ) لە جێگای خۆت بازدەی و دووبارە بێتەوە سەر هەمان جێگا. مەگەر ئەو کاتەی تۆ بازت داوە زەوی نەسوڕاوە؟

منداڵەکە داما و دوای کەمێك بێدەنگی دەستیکرد بە باوەڕپێهێنانی باوکی گووتی هەر چوێنێك بێ زەوی دەسوڕێ. باوکەکە گوتی لە دنیای قسەدا هەموو شتێك دەگوترێ وەلێ تۆ پێم بسەلمێنە تامنیش باوەڕبکەم.

منداڵەکان دەستیان کرد بە روونکردنەوە بەڵام باوکەکە دوو دڵ بوو. وایلێهات تێکڕای ماڵ و منداڵ لەم باس و خواسەدا بەشداریان کرد منداڵەکان چەند خۆشحاڵ بوون کە دیتیان دوای گەڕان لە کتێبباندا وتوێژ لەگەڵ مامۆستاکەیان و تاوتوێ کردنی بابەتەکە توانیان وەڵامێکی حاشاهەڵنەگر بدەنەوە باوکیان.

پرسیاری وەك بۆ ئاوا دەڵێی؟ یا بۆ ئاوای لێدێ؟ منداڵ هاندەدا ئەو شتەی بەشێوەی میکانیکی فیربووە بیری لێبکاتەوە.

## لەمەڕ خوێندنەوەی کتێب

پۆشکین شاعیری مللی رووس دەڵێ (خوێندنەوە باشترین فێربوونە). هەر لە منداڵییەوە خەملاندنی پەیوەندی قووڵ لەگەڵ کتێب و هۆگری کردنی منداڵ لەگەڵ خوێندنەوە یا لانی کەم هەر رۆژێك چەند روپەرێکی نەخوێند بێتەوە ئەو رۆژە بە رۆژێکی بە نرخ نەژمێردرێ، سەپاندن و گەیشتن بە مەبەستە، مەگەر ئەرکی گرینگی ماڵ و قوتابخانە نییە لەمەڕ پێگەیاندن؟

دیارە دەبێ بناغەی ئەم کارە لە ماڵەوە دابنرێ، زۆر پێش چوونە قوتابخانەی منداڵان هۆگری کتێب دەبن، ئەم هۆگرییە بە ئاسانی گەشەدەکات. ئەگەر منداڵ تەنیا جارێك لە کتێبێکی وێنەدار بڕوانی، یا کتێبێك بخوێنێتەوە لەگەڵ تەمەنی یەکبگرێتەوە، گوێبیستی چیرۆك و داستان بێ، ئیتر کتێبی لا خۆشەویست دەبێت. بابەنگەلی سەرنج راکێشی پالەوانی و ئەفسووناوی لە کتێباندا هەیە، لەم رووەوە تامەزرۆی فێربوونی خوێندنەوەی کتێب دەبێ حەزدەکەن گوێ لە خوێندنەوەی گەورەکان بگرن. دایکان و باوکان پێویستە ئەم حەزە تازە لە دایکبووەی منداڵەکانیان کوێر نەکەنەوە، بەڵکو بەرەو پیری حەز و ویستەکانیان بچن، کتێبیان بۆ بخوێننەوە، چەند کتێبێکیان بۆ ئامادەبکەن و بیخەنە ناو کتێبخانەکەیان.

ئەو دایك و باوکانەی دەیانەوێ گەلێك سەرگەرمی بۆ منداڵەکەیان برەخسێنن، تا دەتوانن چالاکتری بکەن، زۆر جار لە بیردەکەن کە باشترین، بە کەڵکترین، و نزیکترین سەرگەرمی ئەو کاتەیە کتێبێکی بە دەنگی بەرز بۆ دەخوێننەوە. جگە لەوەی ئەم کردەوەی خانەوادە کەش و هەوایەکی پتری تێگەیشتن، دۆستایەتی گەرم و گوڕ وەدیدێنێ. هیچ شتێك بەم ئەندازەیە دایك و باوك و منداڵان لێك نزیك ناکاتەوە. پەیوەندییەکی روحی گشتگیر لە نێوانیاندا دەخوڵقێنێ. زۆرجاران دیتراوە رەهەندی وتووێژەکانی ناوخێزان لە ئەنجامی خوێندنەوەی بە کۆمەڵی کتێب



دەوڵەمەنتر بووە. ئاسایی لە بارەی پاڵەوانی ئەو کتێبەی خوێندویانەتەوە دەست دەکەن بە گفتوگۆ لە ئاکارەکانیان دەدوێن رای خۆیان لەمەڕ ئەو ئاکارانە دەردەبڕن، ئەم وتووێژانە چ باش چ خراپ کاریگەرن پەروەردەکردن. تێگەیشتنی ئەو کتێبانەی خوێندراونەتەوە، لە گەمە جۆرا و جۆرەکانی و لە نیگارکێشانی منداڵەکاندا رەنگدەداتەوە.

ئاسایی پاڵەوان گەلی ئەدەبی خۆشەویست هەن ئەو منداڵانەی لە تەمەنی فامکردنەوە نزیکن و مێرمنداڵان هەوڵدەدەن پەیڕەویان بکەن، بە تایبەتی کتێبگەلێك هەن ئەوانە تا ئەندازەیەك ئاوات و ئارەزووەکانیان تێدا دەبینن لە بارەی ژیان و پالەوانەکانیان زانیاری وەدەسدێنن.

زۆر بە جێیە منداڵانی گەورەتر بە دەنگی بەرز کتێب بۆ دایك و باوکیان بخوێننەوە، بابەتی ئەو کتێبانەی خوێندویانەوە بیگێڕنەوە. ئەم ئاخاوتنیان کامڵ، زمان و پاشەکەوتی زمانەوانیان دەوڵەمەندتر دەکا. زۆر گرینگە لەو کاتانەدا دایك و باوك بە وردی و بە دڵ گوێبدەنە کتێب خوێندنەوەی منداڵەکانیان و گۆی شلکەن بۆ ئەو داستانانەی لە کتێبەکانەوە دەیگێڕنەوە. چونکە حەزی خوێندنەوەی کتێب و گێرانەوەی بابەتەکانیان پتر دەبێت، خۆ ئەگەر جارجار بۆیان بخوێننەوە کارێکی باشە. دوایی بە ناچاری باس و خواس دێتە پێش و روون دەبێتەوە کە ئایا منداڵەکان لە بابەتی کتێبەکە و بیر و را و ویستی نوسەرەکەی تێگەیشتوون یا نە. چ قوتابخانە و چ لە کتێبخانە دایك و باوك دەتوانن لیستی هێندێك کتێبی ئەدەبی بۆ ئەو منداڵانە پێشنیار بکەن کە لە تەمەنی فامکردنەوە نزیکن. کۆنترۆڵکردنی هەڵبژاردن و زانینی ئەو کتێبانەی منداڵان سەربەخۆ دەیخوێننەوە زۆر گرنگە و پێویستە لەم بوارەدا تەمەنیان لەبەرچاو بگیرێ. ئەمە ئەرکی دایك و باوکە هەر چۆنێك بێ منداڵەکەیان هانبدەن کتێبی باش بخوێنێتەوە. هاندان بۆ خوێندنەوە مانای رێزدانانە بۆ منداڵ و دانە برانیەتی لە خوێندنەوە. زۆر باشە لە

رۆژی لە دایکبوونی منداڵ یا دوای تەواوکردنی سەرکەوتوانەی ساڵەکانی قوتابخانە کتێب کردنە دیاری ببێتە نەریت.

با لە دەروونی منداڵدا ببێتە باوەڕ کە کتێب باشترین دیارییە و دەرکەوتنی کتێبێکی نوێ لە کتێبخانەدا جەژنە.

پێویستە لە ماڵیدا مامەڵەیەکی جوان لەگەڵ کتێب بکرێت، بۆ نموونە پێش ئەوەی کتێب بە دەستەوەربگرن دەستیان بشۆنەوە، هیچ کات لەسەر بەرگ و رووپەری نەنووسن و نەخش و نیگار نەکێشنەوە. پێنووس و شتی قوورس و رەقی پێدانەهێنن. دوای خوێندنەوە بیخەنەوە شوێنی خۆی. پەیڕەوی کردنی ئەم رێسایانە شارستانیەت و خووخدەی مامەڵە کردن لەگەڵ کتێب پەروەردە دەکا.

دایك و باوکانی هێژا ئێوە پتر لە هەمووان حەزدەکەن منداڵەکانتان رێزتان بگرن و بە درێژایی ژیان بە چاکە یادتان بکەنەوە. باوەڕبکەن یەکێك لەو رێبازانەی بۆ گەیشتنە ئەو مەبەستە جێگای دڵنیاییە، ئەوەیە ئەوین و خۆشەویستی کتێب لە دەروونی منداڵدا بجولێنێ، بە دەنگی بەرز کتێبیان بۆ بخوێننەوە، کە خۆیان فێری خوێندنەوە بوون ئەوەی خوێندیانەوە بۆیان گێڕانەوە گوێیان لێبگرن، کتێبیان بۆ بکەنە دیاری، لە دەروونیاندا ئەو هەستە باربێنن کە کتێب باشترین دۆست، باشترین راوێژکار، باشترین بارهێنەری مرۆڤە.

ئەم کردەوەیە رێز و خۆشەویستی و ئەمەکناسی منداڵەکانتان لە ئاست ئێوە وەدیدێنێ واتە باشترین پاداشتی منداڵەکانتانە بۆ ئێوە.



## ریزی منداڵان بگرن

زۆر لە دایك و باوکان لە دەست زەبر و زەنگی منداڵەکانیان سکاڵا دەکەن. ئەمەش ئاکارێکە هەموو شێوە و رواڵەتەکانی دزێوە، وەلێ بۆ پەروەر کارێك ئەو فاکتەرانەی دەبنە رەفتاری دڕدۆنگی ناخێرێنە پشت گوێ.

مامەڵەی نادادپەروەرانە لەگەڵ منداڵان کینەی دەروونی و زەبر و زەنگ وەدیدێنێ. هەڵەیە ئەگەر وای وێنابکەی ئەو منداڵانە لە زگماکدا دڕدۆنگن یا ئەوە یەکێکە لەو ئاکارانەی لە سەرەتاوە لە گەڵیدا بووە.

لە پرسە یاساییەکاندا بنەمایەك هەیە دەڵێ: هەموو کەس بێتاوانە تا پێچەوانەکەی نە سەلمێنرێ. ئەمە برگەیەکی دادپەروەرانەیە ئابروو مافی کەسایەتی وەك یەك دەپارێزی پێویستە هەم بۆ گەورەکان و هەم بۆ منداڵان بە یەکسانی کەڵکی لێوەربگیرێ.

هات و هاواری پەروەرکار یا حاڵەتی خۆکروشم کردن یا خۆ گێلکردن و گاڵتە پێکردن لە منداڵدا وەدیدێنێ، چونکە لە پشت پەردەی ئەو شەرەنگیزیەوە لاوازییەك هەیە. هەڵەیەکی تر لە هەڵەکانی پەروەردەکردن بریتییە لەو بڕوایەی کە ئەگەر راستگۆیانە لەبەردەم منداڵ پێ بە هەڵەکانیاندابنێن ئەنجامی لاوازییە. هەموو کەس هەڵە دەکات چ پەروەرکار چ سەرپەرشتی منداڵ وەلێ بە ئاسانی دەکرێ ئەنجامەکەی پۆچەڵ بکرێتەوە. بەو مەرجەی راستگۆیانە دان بە هەڵەکەدا بنرێ و قەرەبوو بکرێتەوە، تاگیانی ئاشتی و خۆشەویستی و دادپەروەری لە دڵی ئەو منداڵەدا وەدیبێنێ کە ئەزیەت و ئازاری چێشتووە. لە ئاکامی ئەم کارەدا پەروەرکار نەك هەر کەسایەتی خۆی لە دەست نادا بە پێچەوانەوە پتەوتری دەکات و رێز و بڕوای منداڵەکە بۆ لای خۆی رادەکێشێ.

پێویستە ڕێز بۆ منداڵان دابنێین لە بیرمان بێ بە ڕێز گرتنیان وەك مرۆڤ دەتوانین بە ڕێك و پێکی پێیان بگەیەنین.

## گەشە و کامڵبوونی دەنگ و ئاخاوتنی منداڵ

منداڵان حەزدەکەن بە دەنگی بەرز بە ویست و ئارەزووی خۆیان بدوێن بیکەنە هات و هاوار و بقیژێنن، وەلێ ئەگەر هەمیشە ئاوابێت لێیان دەبێتە خوو لە بری ئاخاوتنی ئاسایی بە هات و هاوار ئەدای دەکەن.

بە تایبەتی منداڵی ئەو خێزانانە پر قاوقیژن کە دەنگی بەرزی ڕادیۆکەیان کپ نابێتەوە کاتێك منداڵەکان لەگەڵ یەکتر دەدوێن هەوڵدەدەن بە دەنگی خۆیان بەسەر دەنگی ڕادیۆکەدا زاڵبن. دایك و باوك خۆیان نموونەیەکی بایەخدارن، ئەو دایکەی بۆ سەپاندنی وتەکانی خۆی هەر دەقیژێنێ منداڵەکەی فێردەکا بێ ویست و ئارەزوو لاسایی بکاتەوە. هێندێك لە دایك و باوکان بڕوایان وایە ئاخاوتن بە دەنگێکی بەرز کارێکی چاکە، ڕاست و ڕەوان دەدوێن لە کاتێکدا دەرئەنجامێکی ئاوەژووی هەیە، چونکە لە ڕادەبەدەر گوشار دەخەنە سەر گەرووی کاڵ کرچییان نییە چکۆڵەکانیان بە زۆر پردەکەن و دەسدەکەن بە قسەکردن و گۆرانی گووتن. گوشار خستنە سەر ئەندامۆکە تایبەتیەکانی دەنگ دەبێتە هۆی تەنگەتاو کردنی تێکرای ئەندامەکان واتە، دەم و لێو و زمان. ئەنجامی ئەم کردەوەیەش ئەدا کردنی نارێك و ناشیرین و گۆنەکردنی زمان و خراپ ئاخاوتنە، واتە تاوێك توند و خێرا تاوێك سست و لێککشانەوەی وتەکان. منداڵ دەنگی خۆی دەشوێنی و ناتوانی کۆنترۆڵی بکات. هەرگیز دەنگی خۆش و دلنیشین نابێت.

دەبێ بە تایبەت و بەوردی سەرنج بدرێتە دەنگی ئەو منداڵانەی توانای سترانبێژیان هەیە و ئاگاداری پاراستنی دەنگیان بن. دیارە نابێ پێیهەلکاڵێن و بڵێن بەهرەی



هەیە تالێی نەبێتە خوو تام لە خۆی وەربگرێت. وەلێ لێرەدا گرینگ ئەوەیە پێش وەخت هەوڵنەدرێ بە گوتنی بەند و بەستەی قوورس کە لە سنووری ڕیتمی دەنگ ئەو بەردەرە دەنگە خۆشەکەی بشێوێندرێ.

کوڕان لە قۆناغی فانکردنەوەدا دەنگیان بۆڕ دەبێت. ئەوسا بە دەنگێکی نیمچە پیاوانە نوتگەلی بڵند دەدوێن، لەم قۆناغەدا نابێ بە دەنگی بەرز سترانان بیێژن. لەم ئەنجامی گووتنی زۆرەکی و دەنگ هەڵبژێرن، بەرەبەرە بە تێپەرینی زەمەن دەنگی ڕاستەقنیەی دەردەکەوێ و دەینن گەرووی لە ڕزۆك بووە. دەنگی ناسازگار و نووساو گرفتی ئەدا کردنی هەیە. گۆرانیبێژ هەن دەنگیان زۆر سازگارە بەڵام لەفزیان نارێکە و وشەکان دەجوون و بە کاڵ و کرچی دەدوێن. بەم شێوەیە ئاوازی باش لە ئاکامی ئەم کەم و کوڕیانە دەشێوێ.

ئاشناکردنی منداڵ و دایك و باوك لەگەڵ ئەو هەوڵە بنەڕەتیانەی دەدرێن لە پێناوی ڕاهێنانی دەنگ و پشووی سترانبێژی بابەتێکی گەلێك بە نرخ و بەکەڵکە. زۆربەی ڕاهێنەرانی ئاواز بەو ئەنجامە گەیشتوون کە هونەری پشوو درێژی لە هەڵمژینی هەوای زۆردانییە بەڵکو توانای وردە وردەی بەکارهێنانیەتی واتە دەرهاویشتنەوەی هەناسە بە ڕێك و پێکی. منداڵان پچڕ پچڕ بە شان بڵندکردنەوە هەناسە هەڵدەکێشن بە ئاسانی دەکرێ ئەم خوە تەرك بکەن و فێربن بە کەمێك گوشار خستنە سەردەست لەگەڵ هەناسەکێشان شان بەرزبکەنەوە، ئەو باوکانەی بە دەنگ گۆڕین لەگەڵ منداڵەکانیان دەدوێن زیان بە قسەکردن و سترانبێژی منداڵەکەیان دەگەیەنن، بە لاسایی کردنەوەی دەنگی خودی منداڵەکەیان و خواروخێچ کردنی وشەکان فێریان دەکەن وشەکان بە نارێکی ئەدا بکەن.

ئەرکی سەرشانمان ئەوەیە ڕوون و ڕێك و پێك لەگەڵ منداڵەکانمان بدوێن و ئەگەر ویستمان گۆرانی بڵێین یا داستانێك بگێرینەوە پێویستە ڕەوان و باشتر، لە ڕووی

هونەریەوە راست واتا ئاسایی بێبێژین. فێرکردنی فۆنیتێکی راست دەبێ لە رووی چالاککردنی ئەندامەکانی پەیوەندارەوە دەسپێبکرێ. پرۆسەی چالاککردنی ئەم ئەندامانە دەبێتە هۆی رەخساندنی هونەری گوفتاری.

## لەمەڕ دۆستایەتی منداڵانی نزیك لە تەمەنی فامکردنەوە

دیارە بۆ ئەوەی بتوانین سەرکەوتوانە رێنوێنی دۆستایەتی منداڵانی نزیك لە تەمەنی فامکردنەوە بکەین دەبێ بە باشی هەریەك لە هاوەڵەکانیان بناسین و لایەنی بە هێز و لاوازیان بزانین و بە قووڵایی دۆستایەتیەکەیاندا رۆچن و تێبگەین چ شتێك ئەوانەی لێك نزیك کردۆتەوە.

دەبی بگوترێ دۆستایەتی منداڵانە دیاردەیەکی رێکەوت نییە بەڵکو پێویستیەکی توند و زیندووی هەر منداڵێکی قوتابخانەیە، نابێ ئەم دیاردەیە خامۆشبکرێ بەڵکو دەبێ بە ساخلەمی و رێك و پێکی ئاراستە بکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی خاوەنیەتی هەستێکی خاوێن و بلند و سەرهەڵدانی متمانە پێککردن و وەفاداری و هاوکاری نێوانیان. دەبێ دۆستایەتی ئەوانە بپارێزێی و رێزی لێبگیرێ، چونکە ئەگەر بە رێکی ئاراستە بکرێت یارمەتیەکی باشە بۆ بارهێنانی منداڵان.

ئەو دایك و باوکانەی رەفتاریان نابەجێیە و زۆریش لە خۆیان ڕادەبینن، لە ترسی ئاکامی خراپی دۆستانی منداڵەکەیان یا رەخنەگرتن لە هاوڵەکانیان منداڵەکەیان، زۆر جار دەبنەرێگر لەسەر رێگەی دۆستایەتی ئەم کوڕ یا ئەو کچ لەگەڵ منداڵەکەیان بەم کردەوەیەش رێگەنادەن ئاکاری بە نرخی ئەخلاقی و کەسایەتی منداڵەکەیان گەشە دەکات.



ئەوان ئەرکیان ئەوەیە لە دیدگایەکی فراوانەوە رابەری دۆستایەتی نێوان منداڵەکەیان هاوەڵەکانی بن واتا و مانایەکەی بزانن بە رەوکردەی باش، بە نرخ و لاوچاکی ئاراستەیان بکەن، فێری رێزگرتنی یەکدی و حەق و دادگەریان بکەن.

لەم بارودۆخەدا دەتوانین خۆمان لە تێکدانی بی بەڵگەی دۆستایەتی منداڵەکانمان بە دوور بگرین پەنجە لەسەر لایەنی چاکی ئەم دۆستایەتییە دانبنێن و بەرەو لایەنی پێویست ئاراستەی بکەن. گرنیگ ئەوەیە دایك و باوك لەو دۆستایەتیەدا بەشداری بکەن. ئەوسا تێکڕای ئەو توانایانەی دەدۆزینەوە کە پەروەرکارێك هەیەتی.

کۆتایی